ناوی کتێب: ناسیونالیزمی کورد و ڕوانگەی ڕۆژئاوا

نووسینی : (مارتین ڤان بروینسن، مایکڵ گونتەر، جانیت کلاین، 
ئاندرو کورتیس، دەیڤید ڕۆمانۆ، هاکان ئۆزئۆغلو)

وەرگێڕانی: وریا ڕەحمانی

بابەت: سیاسی

هەڵەچنی: نیشتمان محەمەد

پێیداچوونەوەی زمانەوانی: نەورۆز حاجی سەیدگوڵ

مۆنتاژی کۆمپیتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ:٣٥٠٠ دینار

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠١٢

کوردستان ـ سلێمانی

www.serdam.org

بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە: kteb@serdam.org

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە (١٦٨٩) ی ساڵی ٢٠١١ پێدراوە

# ناسیونالیزمی کورد و ڕوانگەی ڕۆژئاوا

(مارتین ڤان بروینسێن، مایکێل گونتەر، جانیت کلاین،
ئاندرو کورتیس، دەیڤید ڕۆمانۆ، هاکان ئوزئوغلو)

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
**وریا ڕەحمانی**

سلێمانی ٢٠١٢

# پێڕست

## نووسەری وتارەکانی ئەم کتێبە

### پرۆفیسۆر هاکان ئوزئوغلو:

مامۆستای بەشی مێژووی زانکۆی ناوەندی فلۆریدا و بەرپرسی بەشی زمان و شارستانییەتی ڕۆژهەڵاتی نزیک لە زانکۆی شیکاگۆی ئەمریکایە. هاکان ئوزئوغلو دوو کتێبی بە ناوی " گەورەپیاوە کوردەکان و دەوڵەتی عوسمانی" و " لە خەلافەتەوە بۆ دەوڵەتی سیکولار" و نزیکەی ٢٠ وتاری دەربارەی کێشەی کورد و دەوری ناسیونالیزمی کورد لە هاوکێشە نێونەتەوەییەکاندا بڵاو کردوەتەوە.

### پروفیسۆر مایکێل گەنتەر:

مامۆستای زانستە سیاسیەکانە لە زانکۆی تنیسی لە ئەمریکا و سکرتێری ڕێکخراوی EUTCC لە بروکسلە. مایکێل گەنتەر تا ئێستا ٧ کتێبی دەربارەی کێشەی کورد نووسیوە و ٧٢ وتاری دەربارەی بارودوخی کورد لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی جیهاندا بڵاو کردوەتەوە.

### پرۆفیسۆر دەڤید ڕۆمانۆ:

مامۆستای بەشی "سیاسەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە" لە زانکۆی میسوری ئەمریکا و تا ئێستا چەند وتاری دەربارەی بزووتنەوەی کورد لە

ڕۆژنامه نێونەتەوەییەکاندا بڵاو کردوەتەوە. دەیڤید ڕۆمانۆ نووسەری کتێبی "بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد"ـە کە ساڵی ٢٠٠٦ لە لایەن زانکۆی کەمبریجەوە چاپ و بڵاو بوەتەوە.

## پرۆفیسۆر مارتین ڤان بروینسێن:

مامۆستای توێژینەوە ئیسلامیەکانی زانکۆی ئوتریخ و مامۆستای "ئینیستێتۆی نێونەتەوەیی توێژینەوە ئیسلامییەکان لە دنیای مۆدیرن" لە هۆلەندایە. ڤان بروینسێن بەناوبانگترین کوردناسی ڕۆژئاواییە کە چەند کتێب و ژمارەیەکی زۆر وتاری دەربارەی کێشەی کورد بڵاو کردوەتەوە. گرنگترین کتێبی بروینسێن " ئاغا، شێخ و دەوڵەت لە کوردستان"ـە کە وەک سەرچاوەیەکی گرنگ کەڵکی لێوەردەگیردرێت.

## پرۆفیسۆر جانێت کلێن

خاتوون جانێت کلێن پرۆفیسۆری بەشی مێژووی زانکۆی "ئاکرۆن" لە ویلایەتی ئوهایۆی ئەمریکایە و کۆمەڵێک وتاری دەربارەی کورد لە سەردەمی عوسمانی و هەروەها کتێبێک بە ناوی "میلیشیا کوردەکان لە قەڵەمڕەوی عەشیرەتی عوسمانیدا" بڵاو کردوەتەوە.

## پێشەکی وەرگێڕ

بەردەوام ئەو پرسیارە دەخریتەڕوو کە ئایا ئەوە نەتەوەیە کە ناسیونالیزم درست دەکات یان ناسیونالیزمە کە نەتەوە درست دەکات. زۆربەی پسپۆڕانی بواری ناسیونالیزم پێیانوایە کە نەتەوە، ناسیونالیزم دروست ناکات بەڵکو ناسیونالیزمە کە نەتەوە دروست دەکات.

لە ڕاستیدا من پسپۆڕی بواری ناسیونالیزم نیم و لەوانەشە پێناسەی ناسیونالیزم (کە چەمکێکی ئاڵۆزە) باش نەزانم بەڵام وەکوو خوێنەڕیکی ئاسایی پێموایە کە چەمکی ناسیونالیزم پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە چەمکی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە هەیە بە واتایەکی دیکە دەوڵەت ناسیونالیزم پێش دەخات و تەنانەت دەتوانێت هێماکانی ناسیونالیزم بە تایبەت مێژوو و سەروەرییەکان بخولقێنێت. ناسیونالیزم (ئەگەر بە واتای هەست کردن بە شوناسی نەتەوەیی بێت) تەنانەت لە ڕۆژئاواش دیاردەیەکی نوێیە و پاش پێکهاتنی دەوڵەت- نەتەوەکان پێشکەوتوە و گەشەی کردوە.

هیچ گومان لەوەدا نیە کە هەموو نەتەوەیەک خاوەن شوناس و کولتوور و مێژووی خۆیەتی بەڵام ئەوە دەوڵەتە کە ئەو چەمکانە بەرجەستە دەکات و هەستی نەتەوەیی لە ناو خەڵکەکەیدا پەرەپێدەدات و تەیاری دەکات واتا ئەگەر نەتەوەیەک خاوەن دەوڵەت بێت، ئەگەر هەستی نەتەوەیی لە ناو خەڵکەکەشیدا لاواز بێت، دەوڵەت بە شێوەگەلی جۆراوجۆر بۆ بەهێزکردنی هەستی نەتەوەیی هەوڵ دەدات و پاش

ماوەیەکیش ئەو ڕەوتە سەردەخات و سەرەنجام ناسیونالیزم لەو وڵاتەدا پێشدەکەوێت بەڵام ئەگەر خاوەن دەوڵەت نەبێت هەرچەند کە نەتەوەیەکی بەهێز و کۆن و خاوەن کولتوورێکی بەهێزیش بێت هەستی نەتەوەیی خەڵکەکەشی پێشناکەوێت و لەوانەشە ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازتریش بێت.

کوردیش وەکوو نەتەوەیەکی خاوەن مێژوییەکی کۆن و کولتوورێکی دەوڵەمەند بەردەوام هەستی بە کوردبوونی خۆی کردوە و شانازی بە ناسنامەی کوردی خۆی کردوە بەڵام بە هۆی ئەوەی خاوەن دەوڵەتی نەتەوەیی نەبوە، ناسیونالیزمەکەشی گەشەیەکی ئەوتۆی نەکردوە. وەڵامی ئەو پرسیارەش کە بۆ کورد نەبوە بە خاوەن دەوڵەت، ئاسان نیە بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی گشتی سەیر بکەین دەبینین کە کۆمەڵێک هۆکاری ناوخۆیی، ناوچەیی و نێونەتەوەیی تێکەڵ بوونە و ڕێگریان لەوە کردوە کە دەوڵەتی کوردی دروست بێت. هیچ گومان لەوەدا نیە کە چینی نوخبەی کورد لە ڕیزی یەکەم نوخبەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بوە کە بەردەوام هەستی بە شوناسی کوردی خۆی کردوە و ڕێبەرانی کوردیش هاوڕێ لە گەڵ کۆمەڵانی خەڵک بەردەوام بۆ وەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی(لە چوارچێوەی دەوڵەتی سەربەخۆ یان ئۆتونومیدا) خەباتیان کردوە بەڵام ڕەوتی بەدەوڵەتبوونی کورد سەرنەکەوتوە نە لە بەر ئەوەی کە کورد لەو پەیوەندییەدا کەمتەرخەم بوە یان خەباتی بۆ نەکردوە بەڵکوو هۆکارەکەی ئەوەیە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هیچ دەوڵەتێک لە ئەنجامی خەباتی نەتەوەییدا دروست نەبوە بەڵکوو هەموویان لە ئەنجامی ململانێ و ڕێکەوتنی زلهێزە ڕۆژئاواییەکان دروست بوونە .

کوردستان بە هۆی ئەوەی کە خاوەن شوێن و هەڵکەوتێکی جوغرافیایی و ژیۆپۆلۆتیکی تایبەت لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدایە، کەوتوەتە ژێر کاریگەریی هاوکێشە نێونەتەوەییەکان و زلهێزەکان ڕاستەوخۆ دەستیان لە چارەنووس و دوارۆژی ئەم نەتەوەیە وەردا و بە کورتی چارەنووسی بوو بە قوربانی بەرژەوەندی ئەم زلهێزانە. بەریتانیا، ڕوسیا و فەڕەنسا تەنها بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی خۆیان و بێ ڕەچاوکردنی مافی گەلان، نەخشەی ناوچەکەیان گۆڕی و لە ئاکامی ئەم داڕێژتنە نوێیەدا، گەلێ لە نەتەوەکان گەیشتن بە مافی خۆیان و بێ ئەوەی هیچ هەوڵێکیان دابێ، بوون بە خاوەن دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان بەڵام هەندێ نەتەوەی دیکەش لە ئاکامی ئەم داڕێژتنە نادادپەروەرانە و یەکلایەنەیەدا لە مافی دامەزرانی دەوڵەتی خۆیان بێ بەش کران کە بەرچاوترینیان نەتەوەی کورد بوو کە سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی کە گەورەپیاوان و ڕێبەرانی ئەم نەتەوەیە دایان، نەبوو بە خاوەن دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی، بگرە بوو بە ژێردەستی نەتەوە و دەوڵەتەکانی دیکە و سەرەتاییترین مافەکانی لێ زەوت کرا چونکە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی لەگەڵ بەرژەوەندی ئەم زلهێزانە یەکی نەدەگرتەوە. واتا ئەگەر لە چوارچێوەی بەرژوەندی زلهێزەکاندا ببایا، بێ ئەوەی کورد هیچ خەباتێکی بکردبایا یان تەنانەت ئاگاشی لێ ببایا (وەک گەلی ئەفغانستان، سوریا، عێراق، بەحرەین، کووەیت و ...) دەبوو بە خاوەن دەوڵەت و سەروەری بەڵام چونکە بە پێچەوانە بوو، لە مافی دامەزرانی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی بێبەش کراو هەرچەندە خەباتیشی کرد، بێئاکام بوو.

*　　*　　*

هێندەی کە بە جەرگ و دوورەترسن

کەمتر لە بەیەک گەین ئەپرسن

کەس بۆ کەس نابێ چاو دەبەر بێ

هەرکەس دەیەوێ زل و لەسەر بێ

لەم سەرڕەقیە و دەماری زلیان

بێگانە دەبن سواری ملیان

کوردیش کە ببایە یەکدڵ و دەست

دەستیان دەکەوت ژیانی سەربەست

پەیدا دەبو باوو گەورەیی و ژین

ناومان دەرئەکرد بە بیرو زانین

" ئەحمەدی خانی"

لە ڕوانگەی مامۆستا ئەحمەدی خانی ـ بناغەدانەری بیری نەتەوەیی کورد ـ هۆی سەرەکی دیلی و ژێردەستی کوردەکان، هەروەک لە شێعری سەرەوەدا دەردەکەوێ، نکوڵیکردن لە یەکدی و قەبووڵ نەکردنی یەکترە. لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، ئەمە بە واتای بەردەوامبوونی کارەسات و خولقاندنی سەرەمەرگی تراژیدیای کورد بووە. لەوکاتەوە کە تۆمی بێبڕوایی و خۆفرۆشی لە ڕێگەی ئارپاگ (وەزیر و فەرماندەی هێزەکانی ماد) چاندرا، کەلێن و نەخۆشینێکی پیس داوێنی گرتووین کە لە دەروونەوە دەمانخوات و دەمانپروکێنێتەوە، ئەویش بێبڕوایی و ناتەبایی، دەمارگرژی و

خۆبەکەمزانینێکی نادرووست و نازانستیە کە کەسایەتی تاکی کوردی تووشی گرژی و شێواندن کردووە. هەمیشە بە شوێن سێبەری دەسەڵاتێکدا گەڕاوین کە پەنامان بێ و حەشارمان بدات، لە حاڵێکدا کە خۆمان باشتر لە هەر کەس بیرۆکەی چەوتی ئەو باڵادەستەمان ناسیوە، ڕوومەتی ڕاستەقینەیمان بینیوە، کەچی بەوەشەوە شانازیمان بەوە کردوە کە "پاسەوانی مەتبەقی سوڵتان" بین، لە هەرلا کوژرابێت، کورد کوژراوە و بە یەک تیر دوو ئامانجیان پێکاوە، لە بیرۆکەی ئەواندا کورد، کوردە، بە وتەی ژنەڕاڵە تورکەکان "بێچوە گورگ دەبێتە گورگ" و ....

تاکەی دەبێ بەجێی شنەی ئازادی و وڵاتپارێزییەکی ڕاستەقینە، بە زوڵمی دوژمنان بە خۆ بێن و هەبوونێکی جیاواز لە دیترانەوە فام بکەین. لە شەڕی سووردا ئەوان بە چەکی جۆراوجۆر سینگی پێشمەرگە و گەریلاکانمانی دەپێکا و بەندیخانەکان ژوانگەی هەمیشەیی و پەتی سێدارەش هاوڕێی ماڵئاواییمان بوو، بەڵام لە "شەڕی سپی"دا دوژمن کەسایەتی مرۆڤی کورد دەڕووخێنێ، هێما و نموونە و ڕێنوێنی تۆ و من لە ڕێگەی خودی کوردەوە دەخاتە ژێر تەوژم و زەبرو زەنگ و دەیخاتە ئەوپەڕی نەهامەتی و مردنەوە. شەڕێکی ناوخۆیی و براکوژییەکی بێ دەنگ دەست پێدەکات، ئەمە کوشتنێکی بەردەوامە. کەسایەتی کەلاوەی مرۆڤی کورد هەموو هەوڵەکان دەخاتە قۆناخی ناتەبایی و بەربەرەکانیەوە، ڕەخنە دەکاتە رووخان و کۆمەڵگەیەکی مەند و بشێو دەخولقێنێ. گەر لە شەڕی سوور بەرهەڵستی نەیاران بووین، لە گێژاوی شەڕی سپیدا یەکتر دەخۆین. ئەگەر لە شەڕی سوور دارێکمان دەبڕا، هەزاران دار باڵایان دەکرد، کانیاوێکیان بتۆنڕێژ دەکرد، سەدان ڕێژاو لە لوتکەوە دائەبارین،

پێشەوامان دەچووە سەردار، سێدارەکان بێزوی ئازادییان دەکرد و دایکانی کورد لە مالآندا چیرۆکی ئەوین و ئازادییان بۆ کۆرپەکان دەگێڕایەوە و...

پەنجەی تاوان و لادەری بەرامبەر بە هەموومان راکێشراوە، کەس متمانە بەکەس ناکات، هەموو قسەو باسێک لەلایەن ئەوانەوە ئاو دەخواتەوە، گشتمان ناپاکین، حاشا لە خیانەتی کەسمان ناکرێت، هەموو تاوانبارین، داغی سیخۆڕی دوژمن لە سەردڵی هەموومانە، هەردووش سامالّ و خاوێن و چرۆین بەلاّم هەر وەک نیشتمان، دابەشکراو و لەتلەتین ، دڕکی ئاسنی ترس نەتەنیا چوار سنوور، بگرە هەزاران سنووری دەسکردی پێچاوە بە دەوروبەرمانا و سێبەرەکانیش جێگای بڕوا نین...؟!



خوێنەرانی بەڕیز هەروا کە باسم کرد من پسپۆڕی بواری ناسیونالیزم نیم بەڵکوو ئامانجم لە وەرگێرانی ئەم کتێبە تەنها ئەوە بوە کە تا ڕادەیەک ڕوانگە و تێڕوانینی ڕۆژئاواییەکان دەربارەی ناسیونالیزمی کورد نیشان بدەم. لە ڕاستیدا ڕۆژئاواییەکان گەلێ وتاریان دەربارەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ناسیونالیزمی کورد (بە تایبەت لایەنی مێژوویی) نووسیوە بەلاّم زۆربەی وتارەکانیان وتاری شیکاری نین واتا خوێندنەوەی ڕۆژئاواییەکان بۆ ناسیونالیزمی کورد خوێندنەوەیەکی قووڵ نیە و بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ وتاری پسپۆڕە کوردەکاندا بەراورد ناکرێت چونکە ڕۆژئاواییەکان زیاتر بە شێوەی ڕوژنامەنووسانە سەیری ئەو مەسەلەیە دەکەن و بە شێوەیەکی قووڵ ناچنە نێواخنی مەسەلەکەوە. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ بە گشتی دەتوانێت روانگەی ڕۆژئاواییەکان سەبارەت بە چەمکی ناسیونالیزمی کورد لە وتارەکانیاندا ببینێت. بۆ ئەم کتێبە هەوڵ

دراوه  وتاری ئەو  ڕۆژئاوایانە هەڵبژێردرێت کە زۆربەی لێکۆڵینەوەکانیان پەیوەندی بە کوردەوە هەیە و لەو بوارەدا خاوەن بۆچوون و بەرهەمن. زۆربەی نووسەرانی وتارەکانی ئەم کتێبە کۆمەڵێک کتێب و وتاریان دەربارەی کورد بلاو کردوەتەوە، بۆ نموونە مارتین ڤان بروینسێن ئێستا گەورەترین کوردناسی ڕۆژئاواییە کە بەرهەمەکانی بە تەواوی جێگای متمانەن و وەک سەرچاوە کەڵکیان لێوەردەگیردرێت. مایکێل گەنتەریش یەکێ لە پسپۆڕە بەناوبانگەکانی  کێشەی کوردە و  تا ئێستا نزیکەی ٧ کتێبی دەربارەی کێشەی کورد بلاو کردوەتەوە. هیوادارم بە سود بێت.

# دەوری ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی لە سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کورددا (١)

## مارتین ڤان بروینسێن

زیاتر لە ٣٠٠ ساڵ لەمەوبەر، شاعیری کورد و زانای موسڵمان، ئەحمەدی خانی شاکارەکەی خۆی بە ناوی "مەم و زین" هۆنییەوە کە ناسیونالیستە کوردەکان بە حەماسەی نەتەوەیی خۆیانی دەزانن. "مەم و زین" لە لایەکەوە چیرۆکی ئەوینێکی گەورەو تراژیدێکە وەک بەرهەمە کلاسیکەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەک "کلیلە و دمنە"، "خەسرەو و شیرین" یا "یوسف و زلێخا" (لە ڕاستیدا خانی بەرهەمەکەی خۆی لە سەر مۆدێلی "یوسف و زلێخا" داناوە کە لە لایەن شاعیری گەورەی فارس "نیزامی گەنجەوی"یەوە هۆنراوەتەوە)و لە لایەکی دیکەوە چیرۆکی ئەم ئەوینە حیکایەتێکە کە لە ڕێگایەوە نووسەر پەیامێکی سۆفیانە دەگەیەنێت. هەندێ لە بەشەکانی "مەم و زین" لە ڕاستیدا بە ڕوونی بیروبۆچوونە سۆفیانەکانی ئەحمەدی خانی نیشاندەدات (٢).

بەڵام بەناوبانگبوونی ئەم بەرهەمە لەنێوان کوردەکانی سەدەی بیست بەهۆی لایەنێکی دیکەی ئەم بەرهەمەیە کە بە ئاشکرا باسی لێکراوە،

ئەویش ئەوەیە کە "مەم و زین" نەک تەنها شانازی کردن بە شوناسی ئەتنیکی کورد بەشێوەیەکی بەهێز دەردەبڕێت، بەڵکو ئارەزووی دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردیش دەکات. خانی بەرهەمەکەی خۆی بە فارسی نەنووسی کە ئەو سەردەمە زمانێکی گونجاو بوو بۆ دەربڕینێکی ئەدەبی جوان، بەڵکو بە کوردی نووسی. خانی پێشەکی کتێبەکەی بەو گلەیینامەیە دەستپێدەکات کە کوردەکان بوونەتە ژێردەستی دەوڵەتانی دراوسێ بەهۆی ئەوەی لە نێو خۆیاندا یەکگرتوو نین و ئاواتی ئەوە دەخوازێت کە پادشایەک سەرهەڵبدات و ئەم خەڵکە یەکبخات و ئەو (هێزانە)ی کە کوردیان کردووە بە ژێردەستی خۆیان، بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

لە ڕاستیدا گەلێ لە کوردەکانی سەدەی بیست، هەست و سۆزی خۆیان لە ناو دێڕەکانی خانیدا دەبیننەوە و دەڵێن ناسیونالیزمەکەیان ڕیشەیەکی مێژوویی هەیە کە لانیکەم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خانی. ئەم کوردانە دەڵێن خانی بیرۆکەیەکی ناسیونالیستی ڕاگەیاندووە، کەوابوو بزوتنەوەی کورد دەتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە سێ سەدە مێژووی خەباتی نەتەوەیی هەیە (٣).

## ئایا ئەحمەدی خانی کوردێکی ناسیونالیست بوو، ئارەزووی دەوڵەتێکی کوردی دەکرد؟

ئەڵبەتە کۆمەڵێک هۆکاری باش هەیە بۆ ئەوەی ئەحمەدی خانی بە پێشەنگی ناسیونالیزمی کورد دابنێین و من لێرە نیشانیدەدەم کە چۆن بەرهەمەکانی خانی، بە تایبەت "مەم و زین" دەورێکی گرنگی لە قۆناغە

چارەنووسسازەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورددا بینیوە. بەڵام ئایا لە جێی خۆیدایە خودی خانی بە کوردێکی ناسیونالیست بزانین؟

بە بۆچوونی من نەخێر لە جێی خۆیدا نییە و ئێمە ناتوانین لەسەر بنەمای چەند دێڕێکی بەناوبانگی "مەم و زین" بەو ئەنجامە بگەین کە خانی لە بیری دەوڵەتێکی کوردیدا بووە. ئەوە ڕاستە کە ئەحمەدی خانی یەکجار زۆر ئاگاداری شوناسی کوردی خۆی بوو و شانازی پێ دەکرد و چالاکییە ئەدەبییەکانی خۆی خزمەت کردن بە کورد دەزانی. لە سەدەکانی پێشتردا لێکۆڵەر و زانایانی کورد بە گشتی بە زمانی فارسی یا عەرەبی دەیاننوسی. شەرەفخانی بەتلیسی مێژووە بەناوبانگەکەی خۆی دەربارەی مێژووی سەرۆک (عەشیرەتەکان) و ئەمارەتەکان بە ناوی "شەرەفنامە" (کە دروست یەک سەدە پێش لە مەم و زین نووسراوە) بە فارسی نووسیوە. زانا بەناوبانگەکەی دیکەی کورد واتا "ئیدریس بەتلیسی"ش ( لە کۆتایی سەدەی ١٥ و سەرەتای سەدەی ١٦دا ژیاوە) کە لەناو حکومەتدا کاری دەکرد، بەرهەمەکەی خۆی دەربارەی مێژووی عوسمانی و بەرپرسیارێتییە حکوومەتییەکانی خۆی بە زمانی فارسی نووسیوە (٤).

بیرۆکەی نووسین بە زمانی کوردی لەوانەیە قەد بە خەیاڵی ئەم نووسەرانەدا نەهاتبێت، چونکە ئەو سەردەمە فارسی نەک تەنها بە خنجیلانەترین زمان بۆ ئامانجە ئەدەبییەکان لە قەڵەم دەدرا بەڵکو زمانێکیش بوو کە خوێنەرێکی زۆری هەبوو، چونکە زۆربەی خەڵکی خوێندەواری ئیمپراتۆری عوسمانی و موسڵمانەکانی هیند و هەروەها ئێران، دەیانتوانی فارسی بخوێننەوە. ئەحمەدی خانی دەبێ ئاگاداری ئەوە

بووبێ کە بڕیارەکەی بۆ نووسین بە زمانی کوردی (لە باتی زمانی فارسی) دەبێتە هۆی ئەوەی قەد ئەو ناوبانگە پەیدا نەکات کە نموونە گەورەکەی خۆی واتا نیزامی گەنجەوی بەدەستی هێناوە. خانی بە ئەنقەست زمانی کوردی هەڵبژارد بەو مەبەستەی کە پێگە و ڕێزی کولتووری کورد لە چاو دراوسێکانی کوردەکان بباتە سەرەوە، بە وتەی خودی خانی:

دا خەلقێ نەبێژتن کو ئەکراد

بێ ماریفتن، بی ئەسڵ و بنیاد

ئەنواعی میلەل خۆدان کتێبن

کورمانجی تەنێ د بێ حسێبن

خانی یەکەم شاعیرێک نەبوو کە شیعری کلاسیکی بە کوردی دەنووسی، خودی خانی ئاماژە بە شاعیرانی پێش لە خۆی وەک فەقێ تەیران[١]، عەلی حەریری[٢] و مەلای جزیری[٣] دەکات، بەڵام وادیارە گەلێ شاعیری دیکەی کورد ئەو کاتە هەبوون کە ئێستا لەبیر کراون، چونکە بەرهەمەکانیان لەناوچووە. گەڕیدەی بەناوبانگی تورک، ئەولیای چەلەبی[٤] دەڵێت: لە کاتی سەردانەکەی بۆ "ئامیدیە"[٥] لە دەورووبەری ساڵی ١٦٦٠ ژمارەیەکی زۆر شاعیری ڕکابەر بوون کە لە دیوانی میردا دەژیان و شیعری

---

Feqiyê Teyran -[1]

Elî Harîrî-[2]

Melayê Cezîrî-[3]

Evliya Çelebi-[4]

Amadiye-[5]

بەسۆز و هەستیان بە زمانی کرمانجی دەنووسی. ئەولیای چەلەبی ئاماژە بە قەسیدەیەکی خۆشی یەکێک لەم شاعیرانە بە ناوی ڕەمەزان ئەفەندی دەکات. ئەم ئاماژانەی ئەولیای چەلەبی نیشاندەدات کە چالاکییەکی ئەدەبی کوردی گەرموگوڕ لەو سەردەمەدا هەبووە (٥).

چ هۆکارێک بووەتە هۆی ئەوەی ئەدەبیاتی کوردی لە سەدەی ١٧ دا ببوژێتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە سادە نییە، بەڵام من پێموایە کە هۆکارەکەی، زاڵبوونی عوسمانی بووە کە ئەحمەدی خانیش بە دەستییەوە دەناڵێنێت. لە ئیستانبول لە سەدەی ١٦ بەملاوە زمانی تورکی عوسمانی وەک زمانی دیوانی و ڕەسمی جێگای زمانی فارسی گرتەوە. ئەم نموونەیە لەوانەیە شاعیرانی کورد وەک مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی هاندابێت تا ئەدەبیاتی زمانەکەی خۆشیان پێشبخەن. لەوەش گرنگتر، لە سەدەکانی سەرەتای دەسەڵاتداری عوسمانیدا، قۆناغێکی تاڕادەیەک ئارام و سەقامگیر هاتە کایەوە. بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی کورد کە خۆیان کردبوو بە غولامی عوسمانییەکان، چێژیان لە ئۆتۆنۆمی، ئاسایش و بەختەوەری خۆیان وەردەگرت و ئەمەش وای لێدەکردن پشتیوانی لە هونەر و زانست بکەن. میرەکان و دەسەڵاتدارانی عوسمانی (بەیلیر بەگەکان[6] و سەنجاق بەگەکان[7]) یش پشتیوانی حوجرەکان بوون کە تێیاندا لاوە کوردەکان فێری ئەدەبیات و زانستە ئایینییەکان دەبوون. دیوەخان و حوجرەکان شوێنگەلێک بوون کە هونەرە جۆراوجۆرەکان، بە تایبەت ئەدەبیات تێیدا

---

6- beylerbeys

7- sancakbeys

ڕێزی لێدەگیراو بە شێوەی سروشتی شاعیرانی کوردی ئەو سەردەمە لە یەکێک لەم دوانە یان لە هەردووکیاندا بەشدارییان دەکرد.

ئەمە دەمانباتەوە سەر ئەو مەسەلەیە کە ئایا خانی ناسیونالیست بوو یان نا؟ هەندێک لە برگەکانی "دیباچە" (پێشەکییەکەی) مەم و زین، بێگومان ڕەنگ و بۆیەکی مۆدێرنی هەیە. ئەگەر خۆمان بخەینە جێگای ئەحمەدی خانی لە سێسەد ساڵ لەمەوبەر، ئایا دەتوانین وەها کە ناسیونالیستەکانی سەرەتای سەدەی ٢٠ دەڵێن، بڵێین کە خانی داوای دەوڵەتێکی نەتەوەیی کوردی کردووە. لە ڕاستیدا من خۆم گومانم لەوەدا هەیە کە ئەم قسانە هی خانی بێت، لەوانەیە کەسانی پاش ئەو بەسەر بەرهەمەکەیدا زیادیان کردبێت، بەڵام ئەم قسانە لە نوسخە زۆر گرنگەکەی "مەم و زین"یشدا هەیە کە "م ا ڕودینکۆ"[٨] بە گوێرەی ٩ دەستنوسی جۆراوجۆر ئامادەی کردووە کە کۆنترینیان لە ساڵی (١٧٣١-١٧٣٢) دا نووسراوە، واتا پێش ئەوەی ناسیونالیزمی مودێرن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سەر هەڵبدات (٦)، کەوابوو دەبێت خودی ئەحمەدی خانی بووبێت کە نووسیبێتی:

گەر د هوببوا مە پادیشاهەک

............

غالیب نەدبوو ل سەر مە ئەو ڕۆم

و دیسان دەڵێت:

گەر د هەبوو وا مە ئیتیفاقەک

---

M.A. Rudenko-[8]

ویک را بکرا مە ئینقیادەک

ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی

هەمییان ژ مەرا دکر غولامی

تەکمیلێ دکر مە دین و دەوڵەت (٧)

تەحسیلێ دکر مە عیلم و حیکمەت

دەکرێت ئەم (ڕستانە) وەک گلە و گازندەی کوردێک سەیر بکەین کە سەری لەوە سوڕماوە بۆ گەلەکەی دەوڵەتی نییە، لەکاتێکدا خەڵکانی دیکە، تورکەکان، عەرەبەکان و فارسەکان دەوڵەتیان هەیە. بە هەر حاڵ ئەم لێکدانەوەیە دوو کێشەی هەیە: لە سەرچاوەکانی دیکەی ئەم سەردەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە خەڵکی ئەو کاتە بەو شێوازە کە ئەمڕۆ خەڵک خۆیان وەک گروپێکی ئەتنیکی یا نەتەوەیی دەناسێنن، ئەو کاتە خۆیان وا نەدەناساند. ئەحمەدی خانی ئاماژە بە ڕۆم، عەرەب و عەجەم دەکات کە ئەمانەش وەکو دەوڵەتەکانی ئەمڕۆ، گروپی ئەتنیکی نەبوون. ڕۆم لە ئەسڵدا ئیمپڕاتۆری ڕۆم بوو، پاشان بەشی ڕۆژئاواکەی بوو بە بیزانتیوم[٩] و پاشان ئەو ناوە بۆ ئەو حکومەتانەی کە جێگەیان گرتەوە واتا سەلجوقییەکان و تورکەکانی عوسمانی بە کار برا. ئێستاش ئەم ناوە هەندێجار بۆ کۆماری تورکیا بەکار دەبرێت، بەڵام قەد بۆ تورکە ڕەسەنەکان بەکار نابرێت (٨).

وشەی "عەجەم" لە لایەن عەرەبەکانەوە بۆ سەرجەم ئەو خەڵکەی کە زمانیان عەرەبی نەبوو بەکار دەبرا و لە تورکیای عوسمانیشدا بە تایبەت

---

Byzantium-[9]

بۆ سەرجەم ئێرانییەکان، لەوانە تورکەکانی ئێران بەکار دەبرا. عەرەب و کورد (یا کرمانج، خانی هەردوو ناوەکە بەکار دەهێنێت) دەوڵەت نین بەڵکو گروپێک مرۆڤن، بەڵام گومانەکەی من لەوەدایە کە ئایا ئەم ناوانە ڕاست و دروست بۆ هەمان ئەو خەڵکە بەکار دەهێنرێن کە ئەمڕۆ ئێمە مەبەستمانە، کاتێک کە وەک نەتەوەی عەرەب یا نەتەوەی کورد باسی لێدەکەین. هەروەها کە من لەشوێنێکی دیکەدا نووسیومە، دەستەواژەی"کورد" لەو سەردەمەدا وادیارە تەنها مەبەستی عەشیرەتە کوردەکان و بەشێک لە بژاردە (نوخبە) ئاریستوکراتە شارنشینەکان بووە، نەک گوندنشینە غەیرە عەشیرەتییەکان (٩).

مەسەلەی دووەم، سروشتی دەوڵەتەکانە: ئەو کاتە بیرۆکەی دەوڵەت-نەتەوەکان نە لە ئەوروپا و نە لە ئاسیا هێشتا سەری هەڵنەدابوو. نە دەوڵەتێک بە ناوی تورک، عەرەب یا فارس هەبوو، نە هیچ هەوڵێک لە ئارادا بوو بۆ ئەوەی ئەم دەوڵەتانە دابمەزرێن. دەوڵەتانی ئەو کاتە لە سەر بنەمای ناسنامەی ئایینی یا وەفاداری بە بنەماڵەیەکی پادشایی دامەزرابوون، وەک: دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی کە هەردووکیان تورک زمان بوون، بەڵام هیچ تاسەیەکیان بۆ ئەتنیکی تورکی نەبوو. ئەم دەوڵەتانە "چەند ئەتنیکی" بوون و ئەگەر ئەحمەدی خانی بیری لە جۆرە دەوڵەتێک کردووەتەوە کاتێک کە ئارەزووی پادشایەکی کورد دەکات، مەبەستی بە ڕوونی دەوڵەتێکی نەتەوەیی نەبووە بەڵکو مەبەستی دەوڵەتێکی چەند ئەتنیکی بووە کە تێیدا:

"ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی

هەموویان ژە مەرا دکر غولامی."

ئەگەر ئەو پێناسەیە کە ئێرنێست گیلنێر[10] لە ناسیونالیزم کردوویەتی، لە بەرچاو بگرین، ئەو کاتە دەتوانین بڵێین کە خانی کەسێکی ناسیونالیست نەبووە، چونکە ئێرنێست گیلنێر دەڵێت: "ناسیونالیزم پرەنسیپێکی سیاسییە کە یەکینەی سیاسی و نەتەوەیی پێکەوە دەگونجێنێت" (١٠). خانی لە پارچەپارچەبوونی کوردەکان و ئەوەی کە ناتوانن لە نێو خۆیاندا رێکبکەون عاجزە و وای دەبینێت کە ئەم جوداییە بووەتە هۆی ئەوەی کە کوردەکان ببن بە غولامی دەوڵەتانی دەوروبەرو دەڵێت: ئەگەر کوردەکان یەکیان بگرتایا دەیانتوانی بەسەر هەموو ئەم دەوڵەتانەدا زاڵ بن.

"مەم و زین"ی خانی لە سەر بنەمای ئەفسانەیەکی فۆلکلۆری بەناوبانگ و خۆشەویست بە ناوی "مەمی ئالان"(هەندێجار "مەم و زین"یشی پێدەڵێن) هۆنراوەتەوە، بەڵام شێواز و ناوەرۆکەکەی لەگەڵ هەردووکیان زۆر جیاوازە (١١). خانی کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە چیرۆکە بنەڕەتییەکەدا کردووە و چین لەسەر چین پڕی کردووە لە واتا سمبولیکەکان، و بە بیرۆکە سۆفیانەو میتافیزیاییەکان و بیروبۆچوونەکانی خۆی بە نیسبەت سیاسەت دەوڵەمەندی کردووە و بە شێوەی شیعری مەسنەوی فارسی هۆنیویەتییەوە. ئەمە نیشانی دەدات کە موخاتەبەکانی خانی لە پلەی یەکەمدا هەمان موخاتەبەکانی چیرۆکبێژە نەریتییەکان نەبوون کە "مەمی ئالان"یان پشتاوپشت گواستبووەوە، بەڵکو موخاتەبەکاتی کۆمەڵێک کەسی زاناتر بوون کە دەیانتوانی خاڵە سمبولیک و میتافیزیاییەکانی بەرهەمەکەی دەرک بکەن و شێوازە ئەدەبییەکانی

---

Ernest Gellner-[10]

فارسی بزانن بۆ ئەوەی بتوانن پەی بە دەستکەوتەکەی خانی ببەن. لەوانەیە موخاتەبەکانی خانی زۆر کەم بووبن و لەوانەیە تەنها لە دیوەخانی ئەمارەتەکان و حوجرەکاندا بوون.

ژمارەی ئەو دەستنووسانەی "مەم و زین" کە لە کۆمەڵە دەستنووسە گەورەکاندا هەیە، زۆر کەمە. دەڵێن ڕودینکۆ ٩ دەستنووسی جۆراوجۆری "مەم و زین"ی دۆزیوەتەوە و بەکاریهێناوە (کە ٣ دانەی هی کۆمەڵە دەستنووسەکانی ئەلیکساندێر ژابا[11] بوون)، بەڵام تەنها چەند دەستنووسێکی لە ڕۆژئاوا هەیە، زەحمەتە مەزندەی ئەوە بکرێت کە چەندە دەستنووسی "مەم و زین" لە ناو کۆمەڵگەی کوردستاندا بووە پێش ئەوەی کە یەکەم نوسخەی چاپکراوی دەربکەوێت، بەڵام من پێموانییە لە چەند سەد دانەیەک زیاتر بووبێت. ئەگەر وای دابنێین کە نزیکەی بیست کەس هەر دانەیەکیانی خوێندبێتەوە، بە گشتی ژمارەی خوێنەرانی ئەم بەرهەمە زیاتر لە چەند هەزار کەسێک نەبووە. تەنانەت لەوانەیە ئەم مەزەندەیەش زیاد بێت (١٢) کەوابوو تەنها پاش دەرکەوتنی پیشەی چاپ، بەرهەمەکەی خانی موخاتەبەی بە کۆمەڵی پەیدا کرد.

خوێنەرانی خانی ستایشی بەهرەی ئەدەبی خانییان دەکرد، بەڵام ئایا دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین کە خوێنەرانی ئەو کاتە درکیان بەو پەیامە سیاسییەی بەرهەمەکەی دەکرد کە خوێنەرانی ئەمڕۆ درکی پێدەکەن. مەلا مەحموودی بایەزیدی کە ساڵی ١٨٥٠ لە سەر داوای کونسوڵی ڕوسیا لە ئەرزڕوم، ئەلیکساندێر ژابا یەکەم خوێندنەوەی کورتی دەربارەی ئەدەبیاتی کوردی نووسیوە، "مەم و زین" تەنها وەک چیرۆکێکی

---

[11] Alexandre Jaba-

ئەویندارانە (کتێبێکی عاشق و مەعشوق) ناو دەبات. مەلا مەحموود ستایشی بەهرە ئەدەبییەکانی خانی دەکات و دەڵێت: خانی بەناوبانگترین و خۆشەویسترین شاعیری کوردە، بەڵام هیچ لەسەر بەهرە غەیرە ئەدەبییەکانی (مەبەستی بەهرە سیاسییەکانە- وەرگێڕ) خانی ناڵێت (١٣).

لەوانەیە یەکەم کەسێک کە دەرکی بە پەیامە ناسیونالیستییەکەی مەم و زین کردبێت شاعیری باشووری کوردستان، حاجی قادری کۆیی (١٨١٧-١٨٩٧) بووبێت. دەتوانین بڵێین کە حاجی قادری کۆیی وەک کەسایەتییەکی سەرەکی، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر هوشیارییە نەتەوەییەکانی کورد هەم لە باکوور و هەم لە باشووری کوردستان هەبووە. حاجی قادر فەقێ بووە و لە حوجرەکانی پارچە جۆراوجۆرەکانی کوردستاندا خوێندوویەتی (١٤). حاجی لە سەردەمی ئاڵوگۆڕە گەورەکانی کوردستاندا ژیاوە و ئەو کاتەی کە دوایین ئەمارەتە کوردەکان بە دەستی دەوڵەتی عوسمانی لەناو براون، حاجی پیاوێکی جحێل بوو.

دەبێ حاجی لە ئەزموونەکانی دەوڵەتی دوایین حاکمی گەورەی سۆران، میر محەمەدی ڕەواندوزی بەناوبانگ (کە بە میرە کۆرە ناسراوە و لە ١٨١٤ تا ١٨٣٥ حکوومەتی کردووە) کە سەردەمێک دەسەڵاتی بەشێکی گەورەی ناوەند و باکووری کوردستانی بە دەستەوە بووە، شتی زۆر فێر بووبێت، هەروەها حاجی قادر دەبێت چیرۆکی زۆری دەربارەی دەسەڵات و دادپەروەری بەدرخان بەگی بۆتان- کە لە دەیەی ١٨٤٠ خۆی بە تەواوی لە دەوڵەتی عوسمانی سەربەخۆ کرد و زۆربەی ڕۆژئاوا و ناوەندی کوردستانی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی- لە زمانی ڕێبوارەکانەوە بیستبێت. ئەم دوایین دەسەڵاتدارە گەورە کوردانە — کە چیرۆکی

ڕەفتارەکانیان هێشتا لە لایەن چیرۆکبێژەکانەوە دەگوترێتەوەو داستانی ستایشکردنەکانیان وەک گۆرانی دەگوترێتەوە - دەبێت کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر حاجی قادری گەنج کردبێت. ڕەنگە هەرەسهێنانی ئەم کوردە دەسەڵاتدارانە بەدەستی سوپای تەکوزمەندی (ڕێکوپێکی) عوسمانی و پشێوی و نائەمنی قۆناغی پاش ئەوە — کە تێیدا عەشیرەتەکان لەگەڵ یەکدی بەردەوام لە گێرەو کێشەدا بوون — هەستی ناسیونالیزمی ڕۆمانتیکی حاجی قادرو سۆز بۆ ڕابردووی فیودالی ئایدیالی خۆی وروژاندبێت (١٥).

حاجی قادر پاشان چوو بۆ ئیستانبول و لەوێ لەگەڵ بنەماڵە گەورە کوردەکاندا پەیوەندی گرت. حاجی بەهۆی ئەوەی مەلایەکی خوێندەوار و پیاوێکی ئەدیب بوو، بنەماڵەی بەدرخان کردیان بە مامۆستای منداڵەکانیان. وادیارە خودی حاجی کە ئەشراف زادە نەبوو، شانازی بە خزمەتکردن بەم بنەماڵە گەورانە کردووە. لەوانەیە لایەنە ناسیونالیستییەکانی شیعرەکانی حاجی، لە ئەنجامی ئەم تێکەڵاوییەی لەگەڵ بەدرخانییەکاندا دروست بووبێت. لە لایەکی دیکەوە نەوە گەنجەکانی بەدرخانییەکانیش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ناسیونالیزمی حاجی قادرەوە. بە وتەی قەناتێ کوردۆ[١٢]، لە ڕێگای بەدرخانییەکانەوە بوو کە حاجی قادری کۆیی بۆ یەکەمجار لەگەڵ (بیروبۆچوونەکانی-وەرگێڕ) ئەحمەدی خانی ئاشنا بووە (١٦).

پارچە شیعرێکی خودی حاجی قادر، کاریگەریی خانی لە سەر حاجی بە ڕوونی نیشاندەدات و لە ڕاستیدا حاجی قادر بۆ ئەدەبیاتی سۆرانی بوو

---

12- Qanatê Kurdo

بەو کەسایەتییەی کە ئەحمەدی خانی لە ئەدەبیاتی کرمانجیدا هەیبوو، بوو بە پێشەنگێک کە نەوەی دواتری ناسیونالیستە کوردەکان ئیلهامیان لێ وەرگرت و شیعرەکانیان دەخوێندەوە بۆ ئەوەی هەست و سۆزی ناسیونالیستی خۆیان دەرببڕن. هەر وەکو خانی، نووسین بە زمانی کوردی بۆ حاجی قادری کۆییش هەڵبژاردنێکی سیاسی بوو. حاجی دەڵێت: بێ ڕێزگرتن لە زمانی کوردی، نەتەوەی کورد لە کردەوەدا بوونی نییە چونکە کۆمەڵگەی کورد ڕابردووی خۆی نایەتە بیر:

کتێب و دەفتەر و تاریخ و کاغەز

بە کوردی گەر بنووسرایا زوبانی

مەلا و زانا و میر و پادشامان

هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانی (١٧)

حاجی قادری کۆیی تاسەی ڕابردووی کوردە و وەک سەردەمی زێڕینی مێژووی کورد ناو لە ئەمارەتەکان دەبات:

حاکم و میرەکانی کوردستان

هەر لە بۆتانەوە تا بابان

یەک بە یەک حافیزی شەریعەت بوون

سەید و شێخی قەوم و میللەت بوون

سەید و شێخەکان لە ترسی ئەوان

مونزەوی بوون و زاکیری ڕەحمان

ئەو کە فەوتان ریای ئەوان دەرکەوت

سەیری چۆن بوونە پوش و ئاگر و نەوت

یەکێ لەم لاوە ڕوو دەکاتە عەجەم

دووش لەولاوە دەبنە دوژمنی هەم

............

کوا والی سەنندوج، بەگزادەیی ڕەواندوز

کوا حاکمی بابان، میری جەزیر و بۆتان

..................

کوا ئەو دەمی کە کوردان ئازاد و سەربەخۆ بوون

سوڵتانی میلک و میللەت، خاوەنی جەیش و عیرفان (١٨)

ئەگەری ئەوە زۆرە کە حاجی قادر ئەم شیعرانەی پاش خوێندنەوەی "مەم و زین" نووسیبێت چونکە مرۆڤ هەست به کاریگەریی ئەحمەدی خانی لەسەر حاجی دەکات: حاجی هەر وەک خانی به دەست ناکۆکی و بوونی ڕق و کینەی هەمیشەیی لەنێوان عەشیرەتە کوردەکاندا دەناڵێنێت و ئارەزوو دەکات پادشایەکی کورد سەرهەڵبدات. بەهەرحاڵ جیاوازییەک لە نێوان خانی و حاجی قادردا هەیە: ئەحمەدی خانی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە پادشا کوردە ئایدیالەکەی — کە بتوانێت سەرجەم عەشیرەتان یەکبخات - قەد بوونی نەبووە، بەڵام حاجی قادر لەسەر ئەو باوەڕەیە کە میری کۆرە و بەدرخان بەگ (هەرچەند کە حاجی ناویان ناهێنێت) دوو نموونە لەم جۆرە پادشانە بوون.

هەرچەند کە دەکرێت "مەم و زین" وەک ڕەخنەیەک لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی سەیر بکرێت — کە بە تایبەت میری جەزیرەی بۆتان دەورێکی زاڵمانەی تێدا بینیوە -حاجی قادر بە تەواوی ستاییشی میرە کوردەکان دەکات.

من زۆر گومانم لەوەدا هەیە کە بتوانم بە نیسبەت ئەحمەدی خانی باسی ناسیونالیزم بکەم، بەڵام دەتوانم بە ڕوونی ناسیونالیزمێکی

ڕۆمانتیک و ئایدیالیستێک  لە حاجی قادری کۆییدا ببینم. حاجی قادر، مەم و زین بە "کتێبی نەتەوەی ئێمە"(کتێبا میللەتێ مە) دادەنێت، کەوابوو ئێمە دەتوانین بڵێین کە لە گەلێ لە قۆناغە گرنگەکانی پێشکەوتنی بزوتنەوەی کورددا، "مەم و زین" دەورێکی گرنگی وەک سمبولێکی نەتەوەیی بینیوە.

## چاپکراوەکانی مەم وزین

چاپی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی "کوردستان" شتێکی گرنگ بوو. میقداد میدحەت بەدرخان کە یەکەم ژمارەکانی ڕۆژنامەی کوردستانی لە ساڵی ١٨٩٨ لە قاهیرە بڵاو کردەوە، یەکێک لەو منداڵانە بوو کە حاجی قادری کۆیی مامۆستای بوو. لە ژمارەی دووەم و ژمارەکانی دیکەی "کوردستان"دا، میقداد میدحەت بەدرخان هەندێک لە بەشەکانی "مەم و زین"ی بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە ئەدەبیاتی کوردی چەندە بەرزە. میقداد میدحەت بەدرخان نووسی: "من هەندێک لە بەشەکانی "مەم و زین"م  بۆ "عولەما" کانی تورک و عەرەب خوێندەوە و بۆیانم تەرجومە کردەوە، هەموویان دەیانگوت: کە بە حەیاتیان کتێبی ئەوەندە بەهێزیان نەبینیوە (١٩).

شایانی ئاماژەپێکردنە کە ئەو دەستنووسەی "مەم و زین" کە میقداد بەدرخان کەڵکی لێوەرگرتووە، هی حاجی قادری کۆیی بووە. میقداد بەدرخان وەک ڕێزدانانێک بۆ مامۆستاکەی  واتا حاجی قادر لە سێ ژمارەی ڕۆژنامەی "کوردستان"دا، کۆمەڵێک شیعری سۆرانی حاجی بڵاو کردەوە کە حاجی بە دەستی خۆی لە لاپەڕەی کۆتایی دەستنووسەکەدا

نووسیبووی. حاجی لەم شیعرانەدا خۆی بە تەنها کەسێک دەزانێت کە لەپاڵ خانیدا بنەماکانی شیعری کوردی داڕشتووە (٢٠). بەهەرحاڵ ئەم بانگەشەیەی حاجی زیادەڕۆییانەیە، بەڵام هەروەها کە دەبینین حاجی قادر دەوری سەرەکی لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی خانیدا بینیوە. ئایا "مەم و زین"ی خانی لە ڕۆژنامەی "کوردستان"دا بڵاو دەبووەوە ئەگەر میقداد شاگردی حاجی نەبوایا؟

میقداد میدحەت نیازی خۆی دەربڕیوە بۆ ئەوەی دەقەکەی مەم و زین بە تەواوی وەک کتێبێک بڵاو بکاتەوە، بەڵام قەد ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخسا. یەکەم نوسخەی تەواوی "مەم و زین" لە قۆناغی دواتری بزوتنەوەی کورد، واتا ساڵەکانی دوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بڵاو بووەوە کە بۆ ماوەیەکی کورت دامەزراندنی دەوڵەتێکی کورد چاوەڕوان دەکرا. دوابەدوای ئاگربەستی ١٩١٨ و داگیرکردنی ئیستانبول لە لایەن بەریتانیا و فەرەنسەوە، ئەشرافزادە و ڕۆشنبیرە کوردەکان کۆمەڵەیەکی ناسیونالیستیان بە ناوی "کوردستان تەعالی جەمعییەتی"[١٣]"دامەزراند. ئەم کۆمەڵەیە کاریگەری زۆری لەسەر گەلێک لە ڕێکخراوەکان هەبوو کە یەکێک لەوانە "کورد تەعمیمی مەعاریف و نەشریات جەمعییەتی"[١٤] "بوو، کە چالاکی پەروەردەیی و چاپ و بڵاو کردنەوەی دەکرد.

یەکەم کتێبێک کە ئەم ڕێکخراوەیە لە ساڵی ١٩١٩دا بڵاوی کردەوە، "مەم و زین"ی خانی بوو. لە ڕاستیدا ئەم کتێبە تەنها کتێبێک بوو

---

Kürdistan Te`ali Cemiyeti-[13]

Kürd Ta`mim-i Ma`arif ve Nesriyat Cemiyeti-[14]

که "کورد تەعمیمی مەعاریف و نەشریات جەمعییەتی " بڵاوی کردەوەو تەنها چالاکی گرنگی ئەم ڕێکخراوەش بوو(٢١). زۆربەی خاوەن بیران لەسەر ئەو باوەڕەن کە زۆربەی ژمارەکانی ئەم کتێبە پاشان سوتێندراون، بەڵام لانیکەم چەند دانەیەکی هەر مایەوە و گەلێک نوسخەی دەستنووسی لێهەڵگیرا (٢٢). لەوانەیە پاش ئەم چاپکراوە بووبێ که "مەم و زین" لە ڕاستیدا لە سەرانسەری باکووری کوردستاندا ناسرابێ.

یەکێک لە ئەندامانی کوردی "تەعمیمی مەعاریف و نەشریات جەمعییەتی" شایانی سەرنجدانی تایبەتە، چونکە بوو بە یەکێک لە ڕەسەنترین و کاریگەرترین بیرمەندانی موسڵمانی تورکیا لە سەدەی بیستەمدا. ئەم پیاوە سەعید نورسی بوو کە لە حوجرەی کوردەکانی ئیستانبولدا دەیخوێند. نورسی بوو بە کەسایەتییەکی خوێندەوار و پیاوێکی بیرکراوە و زۆر بە پەروەردەی هاوڕێ کوردەکانی گرێدراو بوو. ژیاننامەی نورسی، پەیوەندی لە مێژینەی ئەوی لەگەڵ ئەحمەدی خانی پێوە دیارە. پاش خوێندن لە گەلێک لە حوجرەکانی وان و بیتلیس، نورسی سێ مانگی لە حوجرەیەک لە بایەزید بەسەر برد کە نزیک بوو لەو شوێنەی کە خانی تێدا نێژرابوو. لە ماوەی ئەم سێ مانگەدا لە بایەزید، نورسی زۆربەی کاتی خۆی بە شەو و بە ڕۆژ لە "تربی" (مەزاری) خانی بەسەر برد. خەڵکی ناوچەکە ئەمەیان بینی باوەڕیان بەوە هێنا کە ڕۆحی ئەحمەدی خانی چووەتە ناو سەعید نورسی (ئەحمەدی خانی حەزەرلەرینین فەیزینە مەزهەر ئەلدو) (٢٣).

ماوەیەکی زۆر پاش ئەوە، "نورسی" هێشتا ئەم قۆناغەی ژیانی بە گرنگترین قۆناغی پەروەردەی خۆی دەزانی. بەهەرحاڵ نورسی ماوەیەکی

زۆر پاش ئەوەی کە بە فەرمی لە بزوتنەوەی کورد دابڕا، هێشتا بە توندی گرێدایی ئەحمەدی خانی بوو(٢٤).

پاش سەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالیست لە تورکیا، "کوردستان تەعالی جەمعییەتی" ناچار بوو چالاکییەکانی ڕابوەستێنێت و پاش ساڵی ١٩٢٢ هیچ دەنگێکی نەما(٢٥). بەدرخانییەکان کە بە ئاشکرا دژی کەمالیستەکان ڕاوەستابوون، وڵاتی تورکیایان بەجێهێشت و زۆربەی ئەوانەی کە لە تورکیا مانەوە، لە لایەن کاربەدەستانی کەمالیستەوە تووشی گێچەڵ بوون. سەید عەبدولقادر پاش شۆڕشی شێخ سەعید لەسێدارە درا و سەعید نورسیش زۆربەی ژیانی خۆی لە دوورە وڵاتیدا بەسەر برد.

لە ساڵی ١٩٢٧، جەلادەت و کامەران بەدرخان لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕۆشنبیرانی دیکەی کورد کە لە سوریا دەژیان، کۆمەڵەیەکی نوێی کوردیان بە ناوی "خۆیبوون" دامەزراند. لە ١٩٣٢ برایانی بەدرخان دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی بڵاڤۆکی گرنگی "هاوار" کە یەکەم بڵاڤۆکێ بوو کە بە جیددی ئەدەبیاتی کرمانجی بڵاو کردەوە."هاوار" نووسینی کرمانجی ستاندارد کرد و هەردوو شێوازی ئەلفوبێی لاتین (بۆ یەکەمجار - وەرگێڕ) و عەرەبی بەکارهێنا و لە تێکەڵێک لە گەلێ لە زاراوەکانی هەرێمی (جزیرەی بۆتان - وەرگێڕ)، ئەدەبیاتی ستانداردی کرمانجی دروستکرد.

ئەو خاڵەی کە زۆر جێگای سەرنجە ئەوەیە کە "هاوار" سەرنجی زۆری بە ئەحمەدی خانی دەدا. لە ژمارەی (٣٣)ی "هاوار"دا (١ی ئۆکتۆبەری

١٩٤١) جەلادەت بەگ کە بە نازناوی "هەرەکۆل عەزیزان"[١٥] شتی دەنووسی، وتارێکی لەژێر ناوی "کلاسیکێن مە"[١٦] بڵاوکردەوە کە تێیدا سەرنجی زۆری بە "مەم و زین"ی خانی دەدا. جەلادەت بەگ، خانی لەگەڵ (مەولانا جەلال الدینی- وەرگێڕ) ڕۆمی بەراورد دەکات کە دەڵێن مەلا عبدالرحمانی جامی پێیوتووە"ئەو پێغەمبەر نەبووە بەڵام کتێبێکی پیرۆزی نووسیوە" (نە پێغەمبەرە لێ کیتابا وی هەیە). بەڵام جەلادەت بەگ بانگەشەی ئەوە دەکات کە خانی" نەک تەنها کتێبی نووسیوە، بەڵکو پێغەمبەریشە، پێغەمبەری باوەڕی نەتەوەییمانە، پێغەمبەری بیرۆکەی نەژادەکەمانە" (بەلێ خانی ژی خودان کتێبە، لێ خانی پێغەمبەرەژی، پێغەمبەرا دیانەتا مەیا میللی، پێغەمبەرێ ئۆلا مەیا نەژادییە).

بەهەرحاڵ تەنها بەشێکی کورتی "مەم و زین" لە "هاوار" دا بڵاو بووەوە، بەڵام چەندساڵ دواتر ئەو نوسخەیە کە لە ئیستانبول لە ١٩٤٧ بڵاو کرابووەوە لە حەلەب لە چاپ درایەوە .

کۆماری مهاباد یەکێک لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی بزوتنەوەی کوردە کە "مەم و زین"ی خانی هیچ دەورێکی تێدا نەگێڕا، بەڵام "هەژار"ی شاعیر کە لە کۆماردا چالاک بوو و پاش ڕوخانی کۆمار لە عێراق گیرسابووەوە، ئەحمەدی خانی لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە خەڵک ناساند (٢٦). هەژار "مەم و زین"ی کرد بە سۆرانی کە لە ساڵی ١٩٦٠ لە بەغداد بڵاوبووەوە. ئەم قۆناغە، قۆناغێکی گرنگ بوو، چونکە هاوکات بوو لەگەڵ لەدایکبوونی بزوتنەوەی کورد وەک بزوتنەوەیەکی جەماوەری لە

---

Herekol Ezîzan-[15]

"Klasîkên me"-[16]

عێراق، کە پاش لەناوچوونی حکومەتی پاشایەتی لە لایەن عەبدولکەریم قاسمەوە وەدیهات. گەلێک لە خەڵک لای من باسی ئەوەیان کردووە کاتێک کە وەرگێڕانەکەی "مەم و زین"ی هەژاریان خوێندووەتەوە، کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی یەکجار زۆری ئەحمەدی خانی.

سەرلەنوێ سەرهەڵدانەوەی بزوتنەوەی کورد لە دەیەی ١٩٦٠ لە تورکیاش، کاریگەریی بڵاو بوونەوەی وەرگێڕانی "مەم و زین"ی پێوە دیارە. محەمەد ئەمین بوزئەرسەلان "مەم و زین"ی بە ئەلفوبێی لاتینی بە زمانی کوردی لەگەڵ وەرگێڕانە تورکییەکەیدا بڵاو کردەوە (٢٧). ئەمە یەکەم کتێبی کوردی نەبوو، بەڵام گرنگترین کتێبێک بوو کە لەو ساڵانەدا لە تورکیا بڵاوبووەوە و کاریگەرییەکی زۆری هەبوو. پاش بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە بوو کە ژمارەیەک لە کوردەکان توانییان لە کوردییە گرانەکەی خانی تێبگەن و بەهۆی وەرگێڕانە تورکییەکەی بوزئەرسەلان بوو کە ئەم کتێبە زیاتر لە چاپەکانی پێشووتری "مەم و زین" خوێنەری پەیدا کرد. هەرچەندە کە بوزئەرسەلان هەستیارترین بەشە سیاسییەکانی "مەم و زین"ی سڕیبووەوە، بەڵام دیسان کتێبەکە ماوەیەکی کورت پاش بڵاوبوونەوە قەدەغە کراو کاربەدەستانی حکومەت سەرجەم نوسخەکانی کتێبەکەیان (کە دەستیان پێیگەیشت) لەناو برد. ئەوانەش کە کتێبەکەیان لە دەست دا مابوو، ناچار بوون بیشارنەوەو لە ڕاستیدا گەلێک لە خەڵک لە ترسی (کودەتای وەرگێڕ) سەربازی ئاداری ١٩٧١ کتێبەکەیان بە دەستی خۆیان لەناو برد (٢٨).

## ئەحمەدی خانی و نەتەوەی کورد

ئایا هیچ شتێکی ئەوتۆ هەیە کە مرۆڤ بتوانێت لە سەردەمی خانیدا باس لە نەتەوەی کورد بکات؟ من پێموانییە، هەرچەند کە لەوانەیە بیروڕاکان جیاواز بن. لە نێوان مێژوونووسانی ئەوروپاییش بیروڕای جیاواز هەیە دەربارەی کاتی سەرهەڵدانی یەکەم نەتەوەکان لە ئەوروپادا. هەندێک لە مێژوونووسە کۆنترەکان، بۆ نموونە مارک بلوچ[17] بانگەشەی ئەوە دەکەن کە فەرەنسییەکان و ئەڵمانیاییەکان تا ساڵی ١١٠٠ نەبوون بە نەتەوە، لە کاتێکدا کە مێژوونووسانی دیکە وەک جان هۆیزینگا[18] لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەم مەسەلەیە پێش لە سەدەی ١٤ ڕووی نەداوە. مێژوونووسی نوێتر، ئیوگین وێبێر[19] نیشانیداوە کە تەنانەت تا ساڵی ١٩٠٠ فەرەنسا هێشتا نەبووبوو بە یەک نەتەوە و بەشێوەیەکی ڕوون دەڵێت: "زۆربەی گوندنشینانی فەرەنسا بیریان لە فەرەنسەویبوونی خۆیان نەدەکردەوە، بەڵکو خۆیان تەنها بە گوند یان ناوچەکەی خۆیان دەناساندەوە. تەنها لە ڕێگای پەروەردەی بە کۆمەڵ و خزمەتی گشتی لە سوپا و پەخشی بەرنامە لە ڕادیۆی نەتەوەییـ واتا لە ڕێگای هەوڵە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت - بوو کە گوندنشینان بەرەو لای نەتەوە ڕاکێشران" (٢٩).

---

Marc Bloch-17

Johan Huizinga -18

Eugene Weber -19

هەندێ لە نووسەرانی نوێی بواری ناسیونالیزم، بە تایبەت ئاندێرسۆن[20] و گیلنێر[21] پێداگری لەسەر ئەوە دەکەن کە ناسیونالیزم و سەرهەڵدانی نەتەوە، دیاردەگەلێکی تا ڕادەیەک نوێن. گیلنێر ئەم دیاردانە بۆ سەرەتای قۆناغی پیشەسازی و کۆچی گوندنشینەکان بۆ شار دەگەڕێنێتەوەو ئاندیرسۆن بۆ سەرهەڵدانی چاپی کتێب و ئەو شتە کە خۆی پێیدەڵێت "کاپیتالیزمی چاپ" دەیگەڕێنێتەوە (٣٠). بە بۆچوونی ئاندێرسۆن و گیلنێر لەناوچوونی بەربەستەکانی نێوان کۆمەڵگە گوندییەکان و ناوچەکانی دیکەیە کە ڕێگا بۆ ئەوە خۆش دەکات کە ناسیونالیزم دروستبێت.

ئاندێرسۆن دەڵێت: پێش لە داهاتنی چاپی کتێب، تەنها بژاردەیەکی بچووک دەیانتوانی بخوێنن و بنووسن و لە ئەورووپا ئەم خوێندن و نووسینە بە زمانی نێونەتەوەیی ڕۆشنبیران واتا لاتینی بوو و هەر کتێبێک کە دەنووسرا تەنها چەند دانەیەکی دەکەوتە بەردەستی خوێنەران، بەڵام تەکنیکی چاپ لەناکاو بووە هۆی ئەوەی کە کتێب لە ژمارەیەکی زۆردا چاپ بکرێت و بفرۆشرێت. بەهۆی ئەوەی ژمارەی ئەو کەسانەی کە زمانی ئەڵمانی یا فەڕەنسییان دەزانی، لەوانە زیاتر بوو کە زمانی لاتینییان دەزانی، چاپخانەکان کتێبەکانیان بەو زمانانە چاپ دەکرد بۆ ئەوەی خوێنەری زیاتری هەبێت و کتێبی زیاتر بفرۆشن، کەوابوو لە گرنگی زمانی لاتینی کەم بووەوە و ئیدی بە قازانج نەبوو کە بەرهەمەکان بە زمانێ بڵاو بینەوە کە تەنها چینێکی زۆر خوێندەوار و بژاردەیەکی نێونەتەوەیی لێی تێدەگەیشتن، بەڵکوو دەبوایا بەرهەمەکان بەو زمانە چاپ بوایا کە چین و توێژی زیاتری کۆمەڵگە لێی تێدەگەیشتن.

---

[20] - Anderson

[21] - Gellner

لەنێوان ئەو خەڵکە کە دەیانتوانی ئەو کتێبانە بخوێننەوەو پاشان توانییان ڕۆژنامەکان و بڵاڤۆکەکان بخوێننەوە، هۆشیاری گەشەی کرد و شتێکی هاوبەشیان پەیدا کرد کە ئەوانی لە خوێنەری زمانەکانی دیکە جیا کردەوەو جۆرە کۆمەڵگەیەکی نوێیان پێکهێنا واتا نەتەوە. ئاندێرسۆن باسی کۆمەڵگە وێناکراوەکان دەکات، چونکە تەنها لە خەیاڵی خەڵکدا بوونیان هەیە و بە پێچەوانەی کۆمەڵگە نەریتییەکان کە تێیاندا زۆربەی خەڵک یەکدی دەناسن، لەم جۆرە کۆمەڵگەیانەدا ئەندامانی نەتەوە تەنها چەند کەسێک لە یەکدی دەناسن و ناچارن ئەوانی دیکە وەک خەڵک وێنا (تەسەور) بکەن.

سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەک سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لە ئەورووپا نەبوو، بەڵام بەرهەمەکانی ئاندێرسۆن یارمەتیمان دەدات تا درک بەوە بکەین کە دەزگای چاپ چ دەورێکی گرنگی لە سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کورددا گێڕاوە. گەلێک لە مێژوونووسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە تەنها کاتێک سوودی هەیە باس لە نەتەوەکان و ناسیونالیزم بکەین کە چین و توێژە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان کەم تا زۆر یەک بگرن. هوشیاری نەتەوەیی لەوانەیە سەرەتا لە نێوان چین و توێژەکانی باڵای کۆمەڵگە سەرهەڵبدات، بەڵام هەتا کاتێک کە چینی ناوەڕاست و خواری ئەو کۆمەڵگەیە ئەو هۆشیارییانەی تێدا پەیدا نەبێت، ناتوانین پێیان بڵێین "نەتەوە".

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا گروپێکی بچووکی کوردە ناسیونالیستەکان هەبوو کە زۆربەیان ئەندامی بنەماڵە ئاریستوکراتەکان بوون کە لە ئیستانبول یا تەنانەت لە دەرەوە پەروەردەیان دیتبوو و لەژێر کاریگەریی

بیرۆکە ئەورووپییەکاندا بوون. یەکێک لەوانە، بە ناوی قەدری جەمیل پاشا[22] لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێت کە لە کاتی جەنگی جیهانیدا هەوڵیانداوە پشتیوانی سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان بەرەو لای بیرۆکە ناسیونالیستییەکانی خۆیان ڕابکێشن، بەڵام بێ هیوا بوون، چونکە بیرۆکەی "نەتەوەی کورد" هیچ واتایەکی بۆ ئاغاکان نەبووە، ئیتر خەڵکە عەشیرەتی و گوندییەکە با بمێنێ (٣١)، بگرە قەدری بەگ و دۆستەکانی هیچ بیریان لە قسەکردن لەگەڵ گوندییەکاندا نەکردبووەوەو من پرسیارم لا دروستبووە کە ئایا قەد گوندییەکانیان بە کورد زانیوە.

کەوابوو لە بارودۆخێکی وەهادا شتێکی ئەوتۆ بوونی نییە تا بڵێین کە لەو سەردەمەدا کوردەکان وەک نەتەوە بوون.

لە شوێنێکی دیکەدا من هەوڵمداوە نشانی بدەم کە چۆن کوردەکان پاشان کەم کەم لە ڕێگای یەکگرتن، بەتایبەت ڕاکێشانی خەڵکی گوندەکان بەرەو لای کۆمەڵگەی کورد، وەکو نەتەوە (بەپێی پێناسەی نوێ) گەشەیان کرد (٣٢). ئەگەر بۆ چەند سەدە پێشتر بگەڕێینەوە لەوانەیە بەهەمان شێوە لە خۆمان پرسیار بکەین کە ئەحمەدی خانی کاتێک کە باسی "کورد" و "کرمانج"ی دەکرد بیری لە چی و لە کێ دەکردەوە و ئایا وەکو نەتەوە بیری لێدەکردنەوە؟ بە باوەڕی من خانی لەم ناوانە بەو شێوەیە کە ئەمڕۆ ئێمە کەڵکی لێوەردەگرین، کەڵکی وەرنەدەگرت. من دڵنیام کە خانی گوندییە غەیرە عەشیرەتییەکانی بە کورد نەدەزانی. لەمەزیاتر هەروەها کە پێشتر وتمان، ئەو دەستەواژە سیاسییانەی کە خانی کەڵکیان لێوەردەگرێت وەکو "میلەل" (کۆی

---

22- Qadrî Cemîl Pasa,

"میللەت" کە ئیستا بە واتای نەتەوەیە) لە سەردەمی خانیدا واتایەکی دیکەی هەبووە. ئەگەر ئێمە ناو و دەستەواژەکانی نێو "مەم و زین" بەو شێوەیە لێکبدەینەوە کە ئەمڕۆ واتایان هەیە، لەوانەیە بە هەڵە لەو شتە تێبگەین کە ئەحمەدی خانی لە ڕاستیدا وتوویەتی. لە لایەکی دیکەوە لە ئەدەبیاتدا ئەوە چەسپاوە کە کاتێک کە نەوەیەک شتێک دەخوێنێتەوە، دەتوانێت کۆمەڵێک واتای نوێی تێدا بدۆزێتەوە، واتاگەلێک کە خودی نووسەر قەد ئاگای لێنەبووبێ.

## ئەنجام

هەروەها کە دەزانین، نەتەوە، ناسیونالیزم دروست ناکات، بەڵکو ناسیونالیزمە کە نەتەوە دروست دەکات.

ئەگەر دەبینین کە ئەمڕۆ کورد نەتەوەیە، ئەمە یەکێک لە سەرکەوتنەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردە. من لەم وتارەدا هەڵێنجاندنی ئەوەمکرد کە ئەحمەدی خانی لە ڕاستیدا ناسیونالیست نەبووە، لانیکەم لەو سەردەمەدا بە واتای ئەمڕۆ ناسیونالیست نەبووە. لە لایەکی دیکەوە من هەوڵمدا نیشانی بدەم کە بەرهەمەکانی خانی، بە تایبەت "مەم و زین" لە سەرجەم قۆناغەکانی گەشەسەندنی بزوتنەوەی کورددا دەوری گێڕاوە، کەوابوو لە جێی خۆیدایە کە خانی بە "باوکی ناسیونالیزمی کورد" بزانین. ئەوە ناسیونالیستەکانی دواتری کورد توانییان بیرۆکەکانی خۆیان لە بەرهەمەکانی ئەحمەدی خانیدا ببیننەوەو بە هەڵکەوت نەبووە کە هەر کاتێک کە چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی دەستی پێکردووە، دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوەو سەرنووسەرەکان "مەم و زین"یان بڵاو کردووەتەوە. کەوابوو ناڕاستەوخۆ خانی یارمەتی زۆری بە سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەی زمانی کوردی وەک زمانێکی زیندووی ئەدەبی داوە.

دەوڵەتی تورکیاش بە شێوەی خۆی یارمەتی بە لەدایکبوونەوەی ئەدەبیاتی کرمانجی داوە: بە قەدەغەبوونی ئەو "مەم و زین"-ە کە بوزئەرسەلان بڵاوی کردەوە، ئەم بەرهەمە زیاتر بوو بە سمبولی کولتووری کورد. پاش کودەتای ئەیلوولی ١٩٨٠ سەرکوتی کولتووری کورد لە تورکیا گەلێک لە ڕۆشنبیرانی کوردی ناچار کرد ئەو وڵاتە جێبهێڵن و وەک پەنابەری

سیاسی لە وڵاتگەلێک وەک ئەڵمانیا و بە تایبەت سوید بگیرسێنەوە. ئەم ڕۆشنبیرانە لەم وڵاتانە بواری ئەوەیان بۆ ڕەخسا کە بە کوردی بنووسن و بڵاو بکەنەوە و ئەو خەڵکە کاتێک کە لە تورکیا بوون تەنها بە زمانی تورکی دەیاننووسی، کەم کەم دەستیان کرد بە نووسین بە زمانی کوردی.

لە ماوەی ١٥ ساڵی ڕابردوودا، (زاراوەی) کرمانجی وەک زمانێکی ئەدەبی مۆدێرن گەشەی کردووەو چۆنییەتی نووسین بەم (زاراوەیە – وەرگێڕ) بە شێوەیەکی بەرچاو باشتر بووە. ئێستا ئەدەبیاتی کرمانجی بەردەوام گەشە دەکات و ژمارەی ئەو کەسانەی کە بە کرمانجی دەخوێننەوە، زیادی کردووە. ئەو خاڵە گرنگە، کاتێک کە محەمەد ئەمین بوزئەرسەلان لەم سالانەی دواییدا چاپێکی نوێی "مەم و زین"ی خستە ناو بازاڕ، لە باتی وەرگێڕانە تورکییەکەی جاران، کرمانجییەکەی بە زمانی ئەمڕۆ خستە شوێنی. ئەم پێشکەوتنانە لەوانەیە قەد ڕووی نەدابایا ئەگەر سەرجەم نووسەرە کوردەکان لە تورکیا بمابایانەوە. کەوابوو هەروەها کە تا ئێستا بینیومانە سەرکوتی حکومەت یارمەتی بە بەهێزبوونی ئەو شتە داوە کە حکومەت هەوڵی دەدا لەناوی بەرێ، واتا کولتووری کورد.

هەرچی کوردەکانی تورکیا زیاتر هەوڵبدەن بۆ ئەوەی کرمانجی وەک زمانێکی ئەدەبی مۆدێرن پێشبخەن، ئاواتەکەی خانی زیاتر دێتەدی کە:

"دا خەلقی نەبێژن کو ئەکراد

بێ مەعریفەتن، بێ ئەسڵ و بونیاد"

**سەرچاوە:**

**Martin van Bruinessen, 'Ehmedî Xanî's Mem û Zîn and its role in the emergence of Kurdish national awareness', in Vali, Abbas (ed.), Essays on the origins of Kurdish nationalism, (2003), Costa Mesa, Mazda Publishers, pp. 40-57.**

## پەراوێزەکان:

١- ئەم وتارە یەکەمجار لە کۆنفرانسی سێسەدەمین ساڵیادی "مەم و زین"ی خانیدا خوێندرایەوە کە کۆمەڵەی نووسەرانی کورد لە سوید (کۆمەلا نڤیسکارێن کورد لە سویدێ) لە ٢٧ی مانگی مای ١٩٩٥ رێکیخستبوو، بەڵام بەرەبەرە کۆمەڵێک شتم پێ زیاد کردووەو پێداچوونەوەم کردووە (تێبینی نووسەر). لە راستیدا ناوی ئەم وتارە "دەوری ئەحمەدی خانی لە سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کورددا" یە بەڵام بە هۆی ئەوەی لە گەڵ ناوەڕۆکی وتارەکەدا گونجاوتر بوو کردم بە "دەوری ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی لە سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی کورددا" (وەرگێڕ).

٢- محەمەد ئەنوەر عەلی لە ڕیسالەی دکتۆراکەیدا بە ناوی" احمد الخاني: فلسفات التصوف في ديوانيه مم و زين"، (جامعه القادس يوسف، معهد الاداب الشرقيه، ١٩٧٢) بیروڕا سۆفیانەکانی "مەم و زین"ی شیکردووەتەوە. سوپاسی "مالمیسانیژ م تەیفون" دەکەم کە ئەم توێژینەوەیەی پێنیشاندام.

٣- بۆ نموونە، فەرهاد شاکەلی، کتێبی"ناسیونالیزمی کورد لە مەم و زینی ئەحمەدی خانیدا (سوید، ئۆپسالا، ١٩٨٣، چاپی نوێ، بروکسیل، ئینیستیتۆی کورد، ١٩٩٣) و وتارەکەی موراد جوان بە ناوی "دەورا ئەحمەدێ خانی و کوردەواریا وی"، کۆڤارا چرا، هەژمار٢، حوزەیرانا ١٩٩٥، لاپەڕەی ٣٩-٢٩ )و کتێبەکەی مەدەنی ئایهان بە ناوی "کوردستانلی فیلۆسۆف ئەحمەدی خانی" (ئانکارا، ١٩٩٦).

٤- ئیدریس بەتلیسی، کە لە نەوەی بنەماڵەیەکی بەناوبانگی ئایینی و سۆفی لە بیتلیس بوو، گەورەترین کاتبی دیوانی عوسمانی بووە. هەر ئەویش بوو کە گرنگترین دەسەڵاتدارەکانی کوردی ناوچەی هاندا کە لە شەڕی نێوان عوسمانی و سەفەویدا، لایەنی عوسمانییەکان بگرن کە لە ئەنجامدا زۆربەی (خاکی) کوردستان کەوتە سەر ئیمپراتۆری عوسمانی. کتێبەکانی ئیدریس بەتلیسی بە ناوی "هەشت بەهەشت" و "سەلیمنامە" لە گرنگترین بەرهەمە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە لە قەڵەم دەدرێن.

٥- تێبینییەکانی ئەولیای چەلەبی لە ئامێدییە و باشووری کوردستان لە بەرهەمە چاپکراوەکەیدا بە ناوی"سەیاحەتنامە"دا نییە کە لەسەر بنەمای دەستنووسە ناتەواوەکان چاپکراوە. ئەم تێبینییانە لە بەرگی چواری نووسراوەکانی خودی نووسەر کە لە کتێبخانەی "تۆپکاپی" دا هەڵگیراوە، هەیە.

٦- بنواڕن بۆ:

Axmed Xani,Mam U Zin,Kriticeeskiy tekst,peroved, predislovie I ukazatali M.B.Rudenko(Moskva:NAUK.1962)P 13-16

٧- لە واتای نوێدا،"دەوڵەت" نزیکترین وشەیە بە دەوڵەتی ئەمڕۆ، بەڵام واتا ئەسڵییەکەی ڕوون نەبوو. دەستەواژەی "دین و دەوڵەت" ئاماژە بە ئایینێک یا دەوڵەتێکی تایبەت ناکات، بەڵکو دەستەواژەیەکی تێکچڕژاوە وەک دەستەواژەی "دین و دنیا."

٨- دەستەواژەی باوی "ڕۆمی ڕەش" ئاماژەشە بە دەوڵەتی عوسمانی، بە تایبەت سوپاکەی. بۆیە پێیان دەڵێن ڕەش چونکە جلوبەرگی سەربازانی عوسمانی لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩، ڕەش بووە (سوپاسی ناجی کوتلای دەکەم کە ئەم تۆزە زانیارییەی دامێ).

٩- مارتین ڤان برویینسێن، وتاری"کۆمەڵگەی کورد، ئەتنیسیتە و کێشەی پەنابەران" لە کتێبەکەی فیلیپ کرینبروک و ستیفان سپیریل دا بە ناوی:

"The Kurds :a contemporary overview(London,Rotledge,1992(pp33-36)

10- Ernest Gellner, Nations and Nationalism(Oxford:Basil BlCKWELL,1983)P 1

١٠- بۆ شیکردنەوەی جیاوازییەکانی نێوان چیرۆکە زارەکییەکەی مەمی ئالان و مەم و زینی خانی بنواڕن بۆ:

Michael L.Chet,"And athornbush sprang up between them":Studies on "Mem u Zin",a Kurdish romance(PH.D.dissertation,University of California, Berkeley ,1991(pp.52-62.)

بە بۆچوونی من تێزەکەی مایکێل چایت باشترین توێژینەوەیە کە تا ئێستا دەربارەی نەریتی زارەکی کورد نووسراوە و تێیدا ١٨ گێڕانەوەی جیاوازی مەمی ئالان شی کراوەتەوە.

١٢- کاتێک کە من یەکەمجار ئەم بۆچوونەم دەربڕی، هەندێ لە دۆستە کوردەکانم لەگەڵم هاوڕا نەبوون. کەسێکی خەڵکی دیاربەکر ئاماژەی بە شتێکی گرنگ کرد، ئەویش ئەوە بوو کە لە ناو بنەماڵەی خۆیاندا چەند نوسخەیەکی دەستنووسی "مەم و زین"یان هەبووەو دەیگوت دراوسێکانیشیان هەروا چەند نوسخەیەکیان هەبووە. بە بۆچوونی ئەم کەسە ژمارەی نوسخەکانی مەم و زین زۆر لەو ژمارەیە زۆرترە کە من ئاماژەم پێکردووە. بەهەرحاڵ من بۆ داکۆکی لەم هەڵسەنگاندنەی خۆم دەبێ بڵێم کە گەلێ لەو دەستنووسانەی کە ئەمڕۆ هەیە لە ڕاستیدا لە یەکەم چاپکراوی "مەم و زین" کۆپی کراون (بۆ نموونە ئەو "مەم و زین"ە کە محەمەد ئەمین بوزئەرسەلان کردی بە تورکی و بڵاوی کردەوە). بەهەرحاڵ هەروەها کە پاشان ئاماژەی پێدەکەم سەرهەڵدانی پیشەی چاپ، گۆڕانکاریگەلی گەورەی دروستکردووە، چونکە هەر کتێبێک ژمارەیەکی زۆری لێ بڵاو دەبێتەوەو خوێنەری زۆری هەیە. من ئێستاش لەسەر ئەو باوەڕەی خۆم سوورم کە "مەم و زین" پێش ئەوەی چاپ بێت، لە ڕاستیدا زۆر خەڵک نەیاندەناسی.

١٣- ئەحمەدی خانی زاف ژ غەزەلیات و ئەشعاران و بەیت بە زمانی کرمانجی گوتییە و د زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی ژی دیسان غەزەلیات و ئەشعاران و ئەبیاتی زاف گوتییە و د علومی فنونان ژی قەوی ماهیر و ساحیبی عیرفانە و ژ شوعەراین کوردستانی هەموویان ژی مەحشور و فایقە، بەلکی ژ هەموو شوعەرائان مەقبول و مەمدوحە". بنواڕن بۆ:

**Alexandre Jaba,Recueil de notices de recitts Kourdes(St-Petersbourg,1860)p 15 ,kurdish text**

١٤- قەناتێ کوردۆ ئاماژە بە حوجرەکانی کۆیە، خۆشناو، سەردەشت، هەولێر، کەرکوک، سلێمانی، مهاباد و شنۆ دەکات. بنواڕن بۆ کتێبەکەی قەناتێ کوردۆ بە ناوی:"تاریخا ئەدبیاتا کوردیێ٢ (ستۆکهۆڵم، وەشانێن "ڕۆژا نو"،١٩٨٥)، لاپەڕەی١٨

بنر ژ عەرەب هەتا ڤە گورجان

کورمانجییە بوویە شوبهی بورجان (١٤)

فەرهاد شاکەلی لە شیکردنەوەی ناسیونالیزمی کورد لە مەم و زین دا بەو ئەنجامە دەگات کە ئەحمەدی خانی شانازی بە کوردبوونی خۆی کردووەو وا بیری کردووەتەوە کە کوردەکان وەک خەڵکانی دراوسێی خۆیان نەتەوەیەکن و لەوان کەمتر نین (١٥). ئەمیر حەسەنپوور دەڵێت: کە شەرەفنامە و مەم و زین، نیشانەگەلی ڕەگوڕیشەی مێژوویی ناسیونالیزمی کوردن و ئاماژە بەوە دەکات کە کارەکەی شەرەفخان نیشانەی هەوڵێکی چڕوپڕە بۆ جەختکردنەوە لەسەر دەوڵەتێکی کوردی (١٦). خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە حەسەنپوور لە ڕوانگەی مارکسییەوە لەگەڵ پێشکەوتنی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان هەڵسوکەوت دەکات و لە ڕێگای ئەو شتە کە ناوی دەنێت"ناسیونالیزمی فیودالی و بورژوازی"، سەیری پێشکەوتنەکانی ناسیونالیزمی کورد دەکات. حەسەنپوور هەروەها جەخت لەسەر گرنگی ئەمارەتە کوردەکان دەکاتەوە کە هەندێکیان تا ناوەڕاستی سەدەی ١٩ وەک کیانگەلی سیاسی سەربەخۆ هەر مانەوە. حەسەنپوور هەروەها دەڵێت کە دوای ئەحمەدی خانی، دوایین کۆڵەکەی کوردایەتی، شاعیری نیشتمانپەروەری کوردی سەدەی ١٩، حاجی قادری کۆیی بووە. (١٧)

لە مێژووی کورد و فولکلۆری قارەمانپەروەریدا، (بەیتی) "دمدم" بووە بە جۆرێک ماسادای[٣٨] کورد. قەڵای دمدم لە خواری ناوچە شاخاوییەکانی نزیکی کەناری ڕۆژئاوای دەریاچەی ئورومییە هەڵکەوتبوو کە حاتەم بەگ،

---

Masada-[38]

وەزیری شا عەباسی سەفەوی، میرخانی یەکدەستی برادۆستی لە نۆڤەمبەری ١٦٠٩ تا هاوینی ١٦١٠ تێیدا گەمارۆ دا. کاتێک کە سەرەنجام هێزەکانی ئێران قەڵای "دمدم"یان گرت، بینییان کە هەموو ئەو کەسانەی کە قەڵاکەیان پاراستووە، خۆیان کوشتووە بۆ ئەوەی بە زیندوویی نەکەونە دەستەوە. بەیتی دمدم وەک خەباتێکی کوردانە دژی دەسەڵاتی دەرەکی باسی گەمارۆدانی قەڵای دمدم دەکات و گەلێک کەس بە تەنها حیماسەیەکی نەتەوەیی دەزانن کە دەتوانێت شان لە شانی مەم و زین بدات.

هەرچەند کە هیچ شتێک دەربارەی ئەدەبیاتی کورد پێش لە ئیسلام، بوونی نییە و بێگومان ئەم ئەدەبیاتە بەهۆی شەڕوشۆڕە بێوچانەکانی کوردستان لەناو چووە، بەڵام دەکرێت ئاماژە بە چەند بەرهەم و نووسەرێکی گرنگی دیکە بکەین. بەڵام بەهەرحاڵ سەرەتا دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە هەر لە کۆنەوە کۆمەڵێک نووسەری کورد هەبوون کە بە زمانی عەرەبی، فارسی و تورکی نووسیویانە، ئەمە لە کاتێکدا کە لە قۆناغە نوێیەکاندا گەلێک لە کوردەکان لە زمانەکانی ڕۆژئاوا کەڵکیان وەردەگرت. بەکارهێنانی ئەم زمانە بیانیانە، ڕەگوڕیشە کوردییەکانی ئەم ئەدەبیاتەی تیرە وتار کردووە.

مێژوونووس و ژیاننامەنووسی کوردی سەدەی ١٣، ابن الاسیر[39] بەرهەمەکانی خۆی بە زمانی عەرەبی نووسیوە لە کاتێکدا کە لە سەرەتای سەدەی ١٦، ئیدریس بەتلیسی[40] کتێبەکەی خۆی بە ناوی "هشت

---

Ibn al-Athir-[39]

Idris Bitlisi[40]

بهشت"[٤١] بە زمانی فارسی نووسیوەو تێیدا باسی مێژووی سەرەتای سوڵتانەکانی عوسمانی دەکات. مەلای جزیری کە شاعیرێکی سۆفی بەناوبانگ بوو کە لە سەرەتای سەدەی ١٧ دا دەژیا، رایگەیاند:

" من گوڵی سووری عەدەنی بۆتانم،

من مەشفەلی دلاوەرانی کورستانم"

شیعرەکانی مەلای جزیری هێشتاش لە ناو خەڵکدا خۆشەویستە.

نووسەرە سەرەتاییەکانی دیکەی کورد بریتین لە مێژوونووس و جوگرافیزانی بەناوبانگی سەدەی ١٤، عبدالفدا [٤٢]، شاعیری گەورەی زمانی تورکی، فوزولی[٤٣] (لە ساڵی ١٥٥٦ کۆچی دوایی کردووە)، عەلی حەریری[٤٤]، مەلا ئەحمەدی باتێ[٤٥] و میرمحەمەدی موکیز[٤٦]، ناسراو بە فەقێ تەیران[٤٧].

بە پشتیوانی دیوەخانی ئەردەڵان، ژمارەیەک لە شاعیرانی بێ وێنەی کورد بە زمانی کوردی گۆرانی، شیعریان دەنووسی. ئەم قۆناغە لە مەلا محەمەد پەرێشان[٤٨](ی دینەوەری - وەرگێڕ) لە سەدەی ١٥ تا مەلا عەبدەلرەحیمی مەولەوی[٤٩] (تاوەگۆزی- وەرگێڕ) لە سەدەی ١٩ درێژ بوو

---

[41] Hasht Behesht

Abu al-Fida-[42]

Fuduli-[43]

Eli Heriri-[44]

Mele Ahmed of Bate -[45]

Mir Mihemed of Mukis-[46]

Feqiye Teyran-[47]

Mulla Muhammad Pareshan-[48]

Mulla Abdal Rahim Mawlawi-[49]

و هەروەها شاعیرگەلێک وەک ئەحمەدی تەختی[٥٠]، شێخ مستەفا بێسارانی[٥١]، خانای قوبادی[٥٢] و مەحزونی[٥٣] لە خۆ دەگرێت. (زاراوەی گۆرانی - وەرگێڕ) وەک زمانێکی ئەدەبی دیوەخانی بە نەمانی ئەمارەتی ئەردەڵان لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩ کۆتایی پێهات. پێشینەی ئەدەبی باڵای زاراوەی گۆرانی لەو ڕاستییەدا دەردەکەوێت کە دەستەواژەی "گۆرانی" لە زمانی نوێی کوردی سۆرانیدا بۆ ئاواز بەکاردەبرێت.

لە سەدەی ١٩ و ٢٠دا گەلێک نووسەری گەورەی کورد سەریانهەڵدا کە ناتوانین لێرە ئاماژە بە ناوی هەموویان بکەین، بەڵام سەرەکیترینەکانیان بریتین لە: حاجی قادری کۆیی (کە پێشتر باسمان کرد)، ڕۆژنامەنووسی زۆر نیشتمانپەروەر حاجی تۆفیق (پیرەمێرد)، لێکۆڵەری بێ وێنەی کوردی سوریا محەمەد فەرید کورد عەلی[٥٤]، شاعیری چالاکی نیشتمانپەروەر شێخموس حەسەن جگەرخوێن[٥٥]، فایەق عەبدوڵلا بێکەس[٥٦]، عەبدوڵلا محەمەد زێوەر[٥٧]، ئەحمەد شەوقی کوردی میسری[٥٨] (کە بە شای شاعیران ناسراوە)، برایانی کوردی میسر[٥٩] ( محەمەد

---

Ahmede Texti-[50]

Sheikh Mistefa Besarani-[51]

[52] Khanay Qubadi

Mahzuni-[53]

Muhammad Farid Kurd Ali-[54]

Sexmus Hesen Cegerxwin-[55]

Faiq Abdallah Bakes-[56]

Abdallah Mihemed Ziwer-[57]

Ahmad Shawki-[58]

the Kurdish-Egyptian brothers-[59]

تەیمور و مەحمود تەیمور[٦٠]) و محەمەد شێخ عەبدولکەریم قانع[٦١]. لە ساڵی ١٨٩٨ (ڕۆژنامەی)"کوردستان" کە لە لایەن گروپێک لە کوردانی دەرەوەی وڵات لە قاهیرە بڵاوبووەوە، دەوری بنەڕەتی لە پێشکەوتنی ئەدەبیاتی کورد و ناسیونالیزمی مۆدێرنی کورددا بینی.

لە ساڵی ١٨٨٠، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری ڕاپەڕینێکی بەناوبانگ بەڵام سەرنەکەوتووی ڕێبەرایەتی کرد کە بە بۆچوونی هەندێک کەس بوو بە پێشەکییەک بۆ ڕاپەڕینە ناسیونالیستییەکانی دواتری کورد. شێخ عوبەیدوڵڵا لە نامەیەکی بەناوبانگدا کە بۆ کونسوڵی گشتی بەریتانیا لە تەورێز نووسی، بە ڕوونی ئاماژە بە هەندێک لە جۆرەکانی ناسیونالیزمی کورد دەکات و ڕایدەگەیەنێت: "نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی جودایە، ئایینەکەی جودایە و یاسا و داب و نەریتەکانی جودان. ئێمە نەتەوەیەکی جوداین. ئێمە دەمانەوێت کاروباری خۆمان لە دەستی خۆماندا بێت" (١٨).

## ناسیونالیزمی کوردی کانستراکشێنیست

سەرەڕای ئەم هەڵێنجاندنە پریمۆدیال یا بنەڕەتیانە بۆ نیشاندانی کۆنبوونی ناسیونالیزمی کورد، لێکدانەوەگەلێکی وەها بەهۆی کۆمەڵێک هۆکاری زۆر پتەو لەگەڵ پرسیار ڕووبەڕوو دەبێتەوە. ئەڵبەتە پێش هەموو شتێک دەبێت ئەوە بڵێین کە چەمکی نەتەوەو ناسیونالیزم بە واتای وەفاداری یەکجار زۆری مرۆڤ بە نەتەوەی خۆی، تەنانەت لە ڕۆژئاواش شتێکی نوێیە و بە بۆچوونی گەلێک کەس ئەم چەمکە لە کۆتاییەکانی

---

Muhammad and Mahmud Taymur-[60]

Mihemed Shheikh Abdul Kerim Qani-[61]

سەدەی ١٨ و بەتایبەت لە ماوەی شۆڕشی فەڕەنسا (کە لە ١٧٨٩ دەستیپێکرد) دەستی بە پێشکەوتن کردووە (١٩)، ئەم چەمکە تەنانەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نوێترە. ناسیونالیزمی تورک، فارس و تەنانەت عەرەب زیاتر پاش شەڕی جیهانی یەکەم دوابەدوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی (کە چەند نەتەوەیی بوو) ڕوویدا کە پێداگری لەسەر ئیسلام وەک هۆکاری باڵای وەفاداری دەکرد.

بۆ نموونە مارتین ڤان بروینسن لەگەڵ ئەو بانگەشە باوەدا هاوڕا نییە کە "مەم و زین"ی ئەحمەدی خانی لە سەدەی ١٧ پێشەنگی ناسیونالیزمی مۆدێرنی کورد بووە و دەڵێت کە نە پێش مەرجی سیاسی و نە پێش مەرجی کۆمەڵایەتی – ئابووری کوردستان لە سەدەی ١٧ بۆ دروستبوونی چەمکی نەتەوە لە ئارادا نەبووە، چونکە عەشیرەتەکان ماکی سەرەکی شوناسی کوردی بوون. مارتین ڤان بروینسن دەڵێت : "بە گشتی خەڵکی ئەو کاتە وەکو خەڵکی ئەمڕۆ خۆیان وەکو گرووپی ئەتنیکی یا نەتەوەیی نەدەناساند" (٢٠).

هیوگ سیتۆن واستۆن[٦٢] سەرهەڵدانی ئەو شتەی کە خۆی پێی دەڵێت "ناسیونالیزمی ڕەسمی" لە وڵاتگەلێکی چەند نەتەوەی وەک ڕوسیا و هەنگاریا لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩ شیدەکاتەوە و دەڵێت: "ڕێبەرانی بەهێزترین نەتەوەکان، نەتەوایەتی خۆیان لە هەموو ڕووەکاندا (لە ڕووی ئایینی، زمانی و کولتوورییەوە) بەسەر نەتەوەکانی دیکەدا سەپاند. ئەمانە وڵاتی خۆیان لە ڕێگای دروستکردنی تاکە نەتەوەیەکی یەکشکڵ بەهێز کرد (٢١). بە"ڕووس"کردنی خەڵک لە ئیمپراتۆری ڕوسیا لە کاتی

---

[62] Hugh Seton-Watson

دەسەڵاتداری ئەلیکساندێری سێیەم و نیکۆلاسی دووەم، وێنای نەتەوەیەکی یەکچەشن بوو و پاشان بوو بە مۆدێلێک بۆ دەوڵەتانی نوێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەک تورکیا.

دینیز ناتالی[٦٣] ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن لە ئیمپراتۆری عوسمانی و قاجاردا، نەبوونی پرۆژەیەکی ناسیونالیستی تایبەتی فەرمی لەسەر بنەمای ئیتنیسیتە، پێشی لەوە گرت کە کوردایەتی (ناسیونالیزمی کورد) بەرجەستە یا گشتگیر ببێت (٢٢). بەهەرحاڵ دوابەدوای جەنگی جیهانی یەکەم شێوەگەلی جۆراوجۆری کوردایەتی لە عێراق، تورکیا و ئێران وەک کردەوەی سیاسی سەریهەڵدا (٢٣).

هاکان ئوزئۆغلوو[٦٤] بە جوانی نیشانی دەدات کە چۆن ناسیونالیزمی کورد لە تورکیا تەنها دوابەدوای لەیەکهەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی سەریهەڵدا و گەورە کوردەکان بە شوێن شوناسێکی نوێدا گەڕان. هاکان ئوزئۆغلوو دەڵێت: "لە نەبوونی ئیدوئولوژییەکی کارا وەک عوسمانیزمدا، ناسیونالیزمی کورد تەنها ڕێگای گونجاوی کوردەکان بوو. ناسیونالیزمی کورد ئەنجامی گەڕانێکی یەکجار زۆر بە شوێن شوناس پاش هەرەسهێنانی عوسمانی بوو" (٢٤). کەوابوو ناسیونالیزمی کورد هۆکاری لەیەکهەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی نەبوو، بەڵکو ئەنجامی لەیەکهەڵوەشانەوەی ئەم ئیمپراتۆرییە بوو (٢٥).

---

Denise Natali-[63]

Hakan Ozoglu-[64]

هاكان یاووز[٦٥] بە وردی باسی ڕیشەكانی ناسیونالیزمی كورد لە توركیا دەكات و دەڵێت: "سیاسەتەكانی دەوڵەتی توركیا هۆكاری یەكلاییكەرەوەی بەرەوپێشچوون و سەرو خواركردنەكانی ئیسنۆناسیونالیزمی كورد بوو. هۆكاری سەرەكی بە سیاسیبوونی شوناسی كولتووری كورد، گۆڕانی ئاراستەی ڕاستییە چەند ئەتنیكی و چەند كولتوورییەكانی ئیمپراتۆری عوسمانی بەرەو مۆدێلی دەوڵەت - نەتەوەیی بوو(٢٦). چاكسازییەكانی كەمالیستەكان كە ئامانجی دروستكردنی دەوڵەت - نەتەوەیەكی مۆدێرن لە توركیا بوو، دروستبوونی ئیسنۆناسیونالیزمی كوردی لێكەوتەوە(٢٧). یاووز پێنج قۆناغ بۆ پێشكەوتنی مۆدێرنی ناسیونالیزمی كورد لە توركیا دادەنێت:

١- كاریگەریی سیاسەتە ناوەندییەكانی ئیمپراتۆری عوسمانی لە ١٨٧٨ تا ١٩٢٤

٢- كاردانەوەی عەشیرەتە كوردەكان لە بەرامبەر پرۆژەی نەتەوەسازی مستەفا كەمال ئەتاتورك لە ١٩٢٥ تا ١٩٦١

٣- بە سیكولاربوونی شوناسی كورد لە چوارچێوەی بزوتنەوەی بەرفراوانتری چەپ لە توركیا لە ١٩٦٢ تا ١٩٨٣

٤- ڕاپەڕینی پارتی كرێكارانی كوردستان(پ ك ك ) لە ١٩٨٤ تا ١٩٨٨ و

٥- قۆناغی دوای دەستگیربوونی ڕێبەری PKK ، عەبدوڵا ئۆجالان لە ١٩٩٩.

---

Hakan Yavuz-[65]

هاکان یاووز لە سەراسەری شیکردنەوەکەیدا پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە: "جیاوازی سەرەکی نێوان ناسیونالیزمی کورد و تورک، بوونی دەوڵەتە. بەهۆی ئەوەی کە ناسیونالیزمی کورد لە تورکیا، عێراق و ئێران لە وەڵامی (کردەوەکانی) دەوڵەت- نەتەوە مۆدێرنەکاندا گەشەی کردووە، بەردەوام پێداگری لەسەر "جیاوازییە "ئەتنیکییەکانی خۆی کردووەتەوەو هەندێک جار دەستی بۆ ڕاسیزم (ڕەگەزپەرستی) بردووە بۆ ئەوەی ڕیشەی خۆی لە ناو مێژوودا دابوکتێت (٢٨)."

حەمید بوزئەرسەلان[66] لە بنەڕەتدا لەگەڵ شیکردنەوەکەی یاووز هاوڕایە و دەڵێت: "دوو هۆکاری گرنگ کە نەیهێشت ناسیونالیزمی کورد کاریگەریی بەرچاوی لە ساڵی ١٩١٩ تا ١٩٢١ هەبێت بیرۆکەی برایەتی ئیسلامی و ترس لە دروستبوونی دەوڵەتێکی ئەرمەنی بوو(٢٩). بەهەرحاڵ ڕاگەیاندنی کۆماری کەمالیست لە ساڵی ١٩٢٣ بە واتای کۆتاییپێهاتنی پەیوەندی هەستیاری عوسمانی لە ناوچەکانی ناوەند و ناوچەکانی دیکە بوو. ئەمە تا ڕادەیەکی زۆر هۆکاری بەشداری کەسایەتییە نەریتییە گەورەکانی کورد لە ڕاپەڕینەکانی دواتردا بوو" (٣٠).

ئەم دواییانە عەلی کەمال ئوزجان[67] بیرۆکەکانی نەتەوە و ناسیونالیزمی دەورە کردووەتەوەو کەوتووەتە ژێر کاریگەریی ئەو دەورە نەخوازراوانە کە سەرهەڵدان و دروستبوونی کاپیتالیزمی تورک و کۆماری تورکیا لە ئەنجامی سەرهەڵدانی PKK و دوورکەوتنەوەی کوردەکان لە عەشیرەتچێتی گێڕاویەتی (٣١).

---

Hamit Bozarslan-[66]

Ali Kemal Ozcan-[67]

بەهەمان شێوە لە عێراق، ناسیونالیزمی کورد تەنها پاش جەنگی یەکەمی جیهانی وەک بەدەنگهاتنێک لە بەرامبەر هەوڵەکان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی مۆدێرنی عەرەب — کە بە شتێک زیاتر لە ئۆتۆنۆمییەکی بەرتەسک بۆ کوردەکان قایل نەدەبوو – دەستی بە گەشەسەندن کرد (٣٢). کەوابوو راپەرینەکانی شێخ مەحمودی بەرزنجی لە دەیەی١٩٢٠ و مەلا مستەفا بارزانی کە لە دەیەی ١٩٣٠ دەستیپێکرد، زۆرتر عەشیرەتی بوون و هەندێجار جاشە کوردەکان لە باتی پشتیوانی لێکردن، دژایەتییان دەکرد. بۆ نموونە دەیڤید مەکداوڵ[٦٨] دەربارەی راپەرینەکانی شێخ مەحمود بەرزنجی دەڵێت: "شێخ مەحمود خاڵی هاوبەشی کەمی لەگەڵ رێبەرانی ئەمڕۆی کورددا هەبوو. قسەکان و شێوەی بەیانی شێخ مەحمود لەگەڵ رێبەرانی ئەمڕۆی کورد بە تەواوی جیاواز بوو. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە شێخ مەحمود کاتی خۆی بە هەستی ناسیونالیستی بە فیرۆ نەدا. شێخ مەحمود سەید بوو و بە زمانی ئیسلام لەگەڵ رێبەرانی راپەرینەکەی قسەی دەکرد. شێخ مەحمود ساڵی ١٩١٩ داوای جیهادی کرد (نە خەباتێکی رزگاریدەری نەتەوەیی). لەمە زیاتر شێوەی کارەکەی ئەوە بوو کە کەڵک لە هاوپەیمانییە خزمیی و عەشیرەتییەکان وەربگرێت و ئامانجی دامەزراندنی قەڵەمڕەوێکی شەخسی بوو" (٣٣).

تەنها لە دەیەی ١٩٦٠ بوو کە بزوتنەوەی کورد لە عێراق، تایبەتمەندی بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستی ڕاستەقینەی بەخۆوە گرت. دوابەدوای ڕووخانی کۆماری مهاباد لە کوردستانی ئێران لە ساڵی ١٩٤٦، پاشەکشەی

---

David McDowall-[68]

ڕێبەری بەناوبانگی کوردی عێراق، مەلا مستەفا بارزانی بۆ یەکێتی سۆڤییەت پاشان بوو بە حیماسەیەک بۆ سەرهەڵدانی ناسیونالیزمی مۆدێرنی کورد. مەلا مستەفا بارزانی دەیگوت: "ئێمە ٥٢ ڕۆژ ڕێپێوانمان کرد، ڕێگاکانی شاخە بەرزەکان ٦ تا ١٢ فووت بەفری لێنیشتبوو، ئێمە ٩ جار شەڕمان کرد و ٤ کەسمان لێکوژرا و ٧ کەسمان لێ بریندار بوو" (٣٤). مەلا مستەفا تەنانەت تا دواڕۆژی ژیانی، قەد بە تەواوی دەستی لە تایبەتمەندییەکانی سەرۆک عەشیرەتێک هەڵنەگرت و ئەم مەسەلەیە تا ڕادەیەک هۆکاری ناکۆکییە توندەکەی لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و زاواکەی، جەلال تاڵەبانی بوو.

هەوڵەکانی سەدام حوسەین بۆ جینۆسایدکردنی کورد بە ئامانجی لەناوبردنی کوردەکان لە دەیەی ١٩٧٠ و ١٩٨٠، بە پێچەوانەی ئامانجەکەی، بووە هۆی پتەوبوونی ناسیونالیزمی کورد. شکستی عێراق لە شەڕی کەنداو لە ١٩٩١ بواری بۆ دروستبوونی دەوڵەتێکی دوفاکتۆی کورد لە باکووری عێراق خۆش کرد کە تێیدا هەستی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوو لە زیادبوونی ناسیونالیزمی کوردەکانی عێراق  لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی ژێر دەسەڵاتی کورددا، دەستی بە گەشە کرد (٣٥).

هۆکارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیش دەوری گرنگیان لە پێشکەوتنی ناسیونالیزمی کورد لە عێراقدا بینیوە. پیشەسازی نەوت، دروستکردنی بەنداوگەلی گەورە و کارخانەی چیمەنتۆ و توتن  و میکانیزەبوونی کشتوکاڵ، هەمووی ئەمانە بووەتە هۆی دەوڵەمەندتربوونی کوردەکان و یارمەتی داوە بەوەی خەڵک لە ناوچە گوندییە بچووکە باو و باپیرانییەکانی خۆیان دەربکەون و بێنە ناو جیهانی شارە گەورەترەکاندا.

لە دەیەی سەرەتای سەدەی ٢١، ناسیونالیزمی کوردی عێراق بووە بە پێشکەوتووترین جۆری ناسیونالیزم لە نێو سەرجەمگەلی کورد، بەڵام ڕوونە کە ڕیشەکانی ئەم ناسیونالیزمە زۆرتر نوێن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕووداوانە کە پێشتر بە کورتی باسمانکردن.

فەریدە کوهی کەمالیش[٦٩] ڕیشە نوێیەکانی ناسیونالیزمی کوردی لە ئێران نیشانداوە. لە ئێران، تەنها دوابەدوای ئاڵوگۆڕە بنەڕەتییەکان لە ناو کۆمەڵگەی نەریتی، عەشیرەتی و ڕەوەندایەتی و ئابووری کوردەکان (کە پاش بەدەسەلاتگەیشتنی دەوڵەتی پاشایەتی پەهلەوی لە سەرەتای دەیەی ١٩٢٠ دەستپێکرد) بوو کە کوردەکان هێدی هێدی خۆیان وەک کۆمەڵگەیەکی خاوەن شوناسێکی ئەتنیکی یەکدەست سەیر کردو هەستی کوردی تێیاندا گەشایەوە (٣٦). هەرچەند کە کۆماری کورتە تەمەن و بچووکی کوردستان لە ١٩٤٦ لە ئێران دروستبوو، بەڵام بەهەرحاڵ ناسیونالیزمی کورد لە ئێران بە قەد ناسیونالیزمی کورد لە عێراق و تورکیا گەشەی نەکردووە (٣٧).

لە سوریاش ناسیونالیزمی کورد تەنانەت لەوەی کوردەکانی ئێرانیش گەشەی کەمتری کردووە، بۆ نموونە نیلیدا فۆکارۆ[٧٠] نیشانیداوە کە چۆن گرنگی بەردەوامی وەفادارییە عەشیرەتی و ئایینییەکان پێشی لە بڵاوبوونەوەی ناسیونالیزمی کورد لە سوریا گرتووەو ڕێگای بۆ ئەوە خۆش کردووە کە هێزە ناسیونالیستە عەرەبە ڕکابەرەکان لە سوریا دەستێوەردان لە ناسیونالیزمی کورددا بکەن و دەستکاری بکەن (٣٨). بەهەرحاڵ

---

Farideh Koohi-Kamali-[69]

Nelida Fuccaro-[70]

خۆپیشاندانە خوێناوییەکانی کوردەکان لە سوریا (لە شاری قامیشلۆ – وەرگێڕ) لە بەهاری ٢٠٠٤ نیشانیدەدات کە کوردەکان لە سوریا بەردەوام هەستی گلە و گازندەی ئەتنیکی خۆیان دژی دەوڵەت (کە تەنانەت هەندێ لەوانی لە مافی هاووڵاتیبوون بێبەش کردووە) پێشخستووە.

برایانی بەدرخان (سورەیا، کامەران و جەلادەت بەدرخان) هەوڵیانداوە ناسیونالیزمی کورد لە دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ گەشە پێبدەن یا دروستی بکەن کە ئەمەش بە جوانی نیشانیدەدات کە ڕەگوڕیشەی ئەم ناسیونالیزمە نوێیە. ئەم سێ برایە کوڕی "بەدرخانی بۆتان"ی بەناوبانگ بوون کە ئەمارەتە بەهێزەکەی بە دەستی عوسمانییەکان لە ١٨٤٧ دا ڕووخا. ئەم سێ برایە لەگەڵ کێشەی زۆر ڕووبەڕوو بوون، لەوانە سروشتی دەمدەمی بوونی پەیوەندییەکانی کورد لەگەڵ تورکەکان و سەرەتاییبوونی شتەکان لە کوردستان، هەروەها کە مارتین ئیسترۆهمیەر[٧١] ئاماژەی پێدەکات و دەڵێت: "سەرجەم کوردەکان بە قوڵیی و بە توندی کەوتبوونە دوای پەیوەندییە کۆمەلایەتی، ئیدوئولوژیکی، ئابووری و تاکەکەسییەکانی خۆیان لەگەڵ تورکەکان. ئەم پەیوەندییانە پێشی لە گەشەکردنی شوناسێکی کوردی متمانەبەخۆکەر، بەهێز و جیاواز گرت" (٣٩). لە ڕاستیدا موراد سومەر[٧٢] نیشانیداوە کە چۆن تەنانەت ئەمڕۆش " تورک و کوردەکان گروپێکی یەکپارچە لە ناو پۆلێنبەندی شوناسە نەگۆڕە مێژووییەکاندا پێکناهێنن" (٤٠).

---

Martin Strohmeier-[71]

Murat Somer -[72]

لەوە زیاتر بە بۆچوونی سترۆهێمیر: "زمانی کوردی قەڵاچۆ کرابوو و بۆ پەروەردە یا ئەدەبیات گونجاو نەبوو، کولتوورەکەیان لە دواوە مابوو و مێژووەکەیان ئەفسانە بوو(٤١). لەمە زیاتر هۆکارێکی زمانیی کە پتر لە زاراوەکان کوردەکانی لە یەک جیا دەکردەوە، کێشەی ئەو کوردانە بوو کە بە زمانی تورکی قسەیان دەکرد" (٤٢).

لە ڕاستیدا تەنانەت ئەمڕۆش PKK لەگەڵ ئەم کێشەیە ڕووبەڕوویە، چونکە هەم بە زمانی کوردی و هەم بە زمانی تورکی پەروەردە بە کادرەکانی دەدات. خودی ئۆجالانیش بە دەستی ئەم کێشەیە دەیناڵاند، چونکە زمانی تورکی لە زمانی کوردی باشتر دەزانی و تەنها لەم ساڵانەی دواییەدا بوو کە فێری کوردی بوو. تزاری ڕوسیاش لە ساڵی ١٨١٢ لەگەڵ کێشەیەکی هاوشێوە ڕووبەڕوو بوو، چونکە زۆربەی ئەندامانی حکومەتەکەی لە کاتی داگیرکاری ناپلیۆن بە زمانی فەڕەنسی قسەیان دەکرد. دوابەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و شاڵاوی پاش ئەوە بۆ دروستکردنی دەوڵەت - نەتەوەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کوردەکان کەسێکیان نەبوو تا لە بەرامبەر کەڵک وەرگرتنی مستەفا کەمال ئەتاتورک لە وەفاداری ئیسلامی، ڕابوەستێت. ڕێبەرانی کورد وەک محەمەد شەریف پاشا (کە هەوڵی دا لە ڕێگای هاوکاریکردنی لیژنەی ئەرمەنییەکان لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریس لە ١٩١٩ مافی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەستەبەر بکات) وەک خایین سەیر دەکرێت، چونکە ویستوویەتی لەسەر هەڵوێستی کورد سازش بکات. بە وتەی سترۆیهیمیر "دروستبوونی نەتەوەی تورک بەوە گرێدرابوو کە کوردەکان هیچ بەرنامەیەکیان نەبێت بۆ نەتەوەی خۆیان" (٤٣).

پاش هەرەسهێنانی ڕاپەڕینی شێخ سەعیدو ئاگری لە دەیەی ١٩٢٠، برایانی بەدرخان پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ ناسیونالیزمی تورک بە تەواوی پچڕاندو هەوڵیان دا (بە پشتیوانی فەرەنسا لە سوریا) ناسیونالیزمی کورد بە تەواوی گەشە پێبدەن. لە کتێبی "کۆمەڵکوژی کورد لە تورکیا" و "مەسەلەی کوردستان دژی تورکیا" کە هەردووکیان لە لایەن سورەیا بەدرخانەوە لە ١٩٢٨ بڵاو بوونەوە، نووسراوە: "تورکەکان پاش ئەو هەموو هاوکارییە کە لەگەڵ کوردەکان و نەتەوەکانی دیکە کردیان، ئێستا ئامانجیان قەڵاچۆکردن و تاواندنەوەی کوردەکانە. تورکەکان کە لە نەوەی ئاتیلا و چەنگیزخانن[٧٣] ئاڵوگۆڕیان تێدا پێکنایێت و لە سروشتی خۆیاندا وەحشی و شەیتانین" (٤٤).

هەرچەند کە ئەم نووسینانەی بەدرخان بۆ پڕوپاگەندە بووەو شیکردنەوەیەکی ساکار، بە لاڕێدابەر و چەواشەکارانەیە لە مێژووی کورد و تورک، بەڵام کاریگەرییەکی گرنگی لەسەر پێشکەوتنەکانی دواتری ناسیونالیزمی کورد و شیکردنەوەکانیدا دانا. جەلادەت بەدرخان وەک یەکەم سەرۆکی "خۆیبوون"[٧٤] هەڵبژێردرا کە حیزبێکی ترانزنەشنالی کورد بوو کە ساڵی ١٩٢٧ لە لایەن ڕۆشنبیرانی کوردی سوریا لە دەرەوەی وڵات دامەزرا. حیزبی "خۆیبوون" بە دوای ئەوەدا بوو کە بزوتنەوەیەکی ئازادیبەخشی نەتەوەیی کوردی بەهێز لەگەڵ هێزێکی شەڕکەری مەشقپێکراو (کە بە ڕێبەرە عەشیرەتییە نەریتییەکان گرێدراو نەبێت) دابمەزرێنێت و ڕاپەڕینی سەرنەکەوتووی ئاگری لە ساڵی ١٩٢٧-١٩٣٠ بە

---

Attila and Jingiz Khan-[73]

Khoybun-[74]

ڕێکخستن کرد. دوابەدوای ئەوە، جەلادەت بەدرخان ژیانی خۆی بۆ کاری ئەدەبیی تەرخان کرد و یارمەتی پێشکەوتنی ئەلفوبێی کوردی لاتینی دا. لە دوایین ساڵەکانی ژیانی لە دەیەی ١٩٦٠، جەلادەت بەدرخان وەک وتەبێژی مەلا مستەفا بارزانی، ڕێبەری بەناوبانگی کوردی عێراق خزمەتی کرد. ساڵی ١٩٣٧ کامەران بەدرخان کتێبی "هەڵۆی کوردستان"ی بڵاو کردەوە کە هەوڵێکی فۆرمالیتیک و لەبیرکراو بوو بۆ نووسینی چیرۆکێکی حیماسی بۆ هاندانی ئامانجی کوردەکان وەک بەرهەمە کلاسیکەکەی فرانز وێرفێل[٧٥] بە ناوی"٤٠ ڕۆژی موسا داغ[٧٦]" کە بۆ ئەرمەنییەکان نووسرابوو. بەدرخان هەوڵی دا نەتەوەیەکی وێناکراوی کوردی دروستبکات کە قارەمان و نیشتمانپەروەر بێت و ڕێز لە خاکەکەی خۆی بگرێت، خۆی بە شاخەکاندا بناسێتەوە و شانازی بە زمان و میرات و چیرۆکە گەلەری و گۆرانییە جوانەکان و ژنە بەهێز و نیشتمانپەروەرەکانی و یەکرێزی کورد بەگشتی بکات."

بەدرخان تەنانەت هەوڵیدا ئەو بیرۆکەیە پێشبخات کە ئایینی ڕاستەقینەی کورد، ئایینی زەردەشتی بووە و "باخی عەدەنی بابل[٧٧]"هاوشێوەیەکی کوردی لە ئەفسانەی "هەزار دەریاچە" لە بینگول هەبووە. مەتەڵگەلێک وەک "شێر تەنها پشت بە چنگوپەلی خۆی دەبەستێت" نیشانی دەدات کە چۆن کوردەکان تەنها پشتیان بە خۆیان بەستووە و چاوەڕوانی یارمەتی کەسانی دیکە نەبوون.

---

Franz Werfel-[75]

The Forty Days of Musa Dagh -[76]

Biblical Garden of Eden -[77]

بەهەرحاڵ هەوڵی کامەران بەدرخان بۆ دروستکردنی حیماسەیەکی نەتەوەیی کوردی هیچ ئاکامێکی نەبوو و نەیتوانی خزمەتی ناسیونالیزمی کورد بکات. زۆربەی هەرە زۆری کوردەکان ئەو کاتە هێشتا هەستی نەتەوەیی کوردی تێیاندا دزەی نەکردبوو و خۆیان لە موسڵمانانی دیکە جیا نەکردبووەوە.

## ئەنجام

ئەوە کە ڕیشەکانی ناسیونالیزمی کورد زۆرتر (نە بە تەواوی) لە سەردەمی نوێدایە، بە هیچ شێوەیەک بە واتای ڕەتکردنەوەی بوون یا ڕەوایەتی ئەم ناسیونالیزمە نییە. لە ڕاستیدا ئەم تایبەتمەندییە تەنها بە ڕیشە نوێیەکانی ناسیونالیزمی کورد سنووردار نییە چونکە ناسیونالیزمی عەرەب، تورک و فارس تەنها تۆزێک لە ناسیونالیزمی کورد کۆنترن و ناسیونالیزمی نەتەوەکانی ئەورووپاش (کە چەمکی ناسیونالیزم لە ناو ئەواندا لەدایکبوو) تاڕادەیەک نوێن. بەهەرحاڵ ئەوە ڕاستە کە ناسیونالیزمی کورد بە بەراورد لەگەڵ ناسیونالیزمی دراوسێکانی واتا تورکەکان، عەرەبەکان و فارسەکان، مەنگ و پارچە پارچە بوو.

ئەم وتارە نیشانیدا کە ناسیونالیزمی کورد زۆرتر لە سەدەی ٢٠ دا وەک کاردانەوەی ئەتنیکێکی بێ دەوڵەت دژی ناسیونالیزمە فەرمییە خاوەن دەوڵەتەکان (تورکیا، عێراق، ئێران و سوریا) گەشەی کرد. مارتین ڤان بروینسن شرۆڤەی ئەوە دەکات کە "جۆری سیاسەتە نەتەوەسازییەکان کە لە قۆناغەکانی پێشوودا زۆر بە سەرکەوتوویی جێبەجێ بووە، ئێستا ئاکام و ئەنجامی پێچەوانەی بەدواوەیە و لە دەیەی ١٩٧٠وە سەرکوتی دەربڕینی هەستی ناسیونالیزمی کوردی لە باتی ئەوەی ببێتە هۆی لەناوچوونی، بووەتە هۆی بەهێزبوونی ئەم ناسیونالیزمە" (٤٥). هەروەها موراد سومەر بە ئاماژەدانی تایبەت بە کورد، ئەم دواییانە نیشانیداوە کە "چۆن خەڵک دەتوانن چەمکگەلی تێکەڵاو و جۆراوجۆریان بۆ شوناسەکەیان هەبێت، کەوابوو ئیتنیسیتە ناچارە لەگەڵ سەرچاوەکانی

دیکە وەک شوناسی نەتەوەیی، فەرانەتەوەیی و ناوچەییەکان ڕکابەری بکات" (٤٦).

بەهەرحاڵ ئەم کێشە و جیاوازییانە لە ناو ناسیونالیزمی کورددا ئەم ناسیونالیزمەی لە ناو نەبردووە، بەڵکو بەردەوام گەشە دەکات و پوختەتر دەبێت. بۆ نموونە ئەم دواییانە پێشکەوتنی ترانزنەشنالی وێناکراو وەک تۆڕەکانی دیاسپۆرا، ڕێکخراوە نێونەتەوەییە نادەوڵەتییەکان، سیستمی دیموکراتیکی دەوڵەتانی خانەخوێ و سیستمی پێشکەوتووی پەیوەندییەکان، دەرفەتی بنەڕەتی بۆ شێوە نوێیەکانی پشتیوانی لە پڕۆژەکانی ناسیونالیزمی کوردی ڕەخساندووە (٤٧).

لە عێراق دروستبوونی هەرێمێکی پارێزراو و خاوەن ئۆتۆنۆمی یارمەتی بە هاتوچۆی خەڵک و ئاڵوگۆڕی بیروڕاکان و هاتنی سەرچاوەکان بۆ کوردستانی عێراق داوەو هەمووی ئەمانەش یارمەتییان بە پێشکەوتنی چەمکی خۆدەسەڵاتداری کورد داوە (٤٨). لە تورکیا دەستڕاگەیشتن بە ڕێکخراوەکانی یەکێتی ئەورووپا، پەیوەندی لەگەڵ تۆڕی نێونەتەوەیی ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤی بەهێزتر کردووە و گۆڕەپانێکی یاسایی سیاسی نوێی بۆ بانگەشە ناسیونالیستییەکانی کوردەکان دروستکردووە و نەک تەنها لە عێراق، بەڵکو لە ئاستی نێونەتەوەییشدا ڕەوایەتی بە کوردایەتی داوە (٤٩).

لە ڕاستیدا لە سەرەتای سەدەی ٢١، ناسیونالیزمی کورد دەستیکرد بە دروستکردنی کێشەو سەرئێشە بۆ داهاتووی دەوڵەتی ئێران، تورکیا، عێراق و سوریا. ناسیونالیزمی کورد بە تایبەت لە باکووری عێراق پاش دروستبوونی دەوڵەتێکی دوفاکتۆی کورد (کە دوابەدوای شکستی عێراق

له شه‌ڕی که‌نداو له ١٩٩١ پێکهات) بووژاوه‌ته‌وه. له‌ژێر پاراستنی هه‌رێمی دژه‌فڕین که دژی ده‌وڵه‌تی سه‌دام دامه‌زرا و تا کاتی ڕووخانی ئه‌م ڕژێمه به‌رده‌وام بوو، نه‌وه‌یه‌کی کورد له‌ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئیداره‌ی کورددا گه‌وره بووه که ته‌نها زمانی کوردی (نه عه‌ره‌بی) ده‌زانێت. له‌مه‌زیاتر کۆمه‌ڵگه‌ی مه‌ده‌نی کورد که‌م که‌م سه‌ریهه‌ڵداوه‌و گه‌لێک ڕۆژنامه، گۆڤار، ڕادیۆ و ته‌له‌فیزیۆن به زمانی کوردی کار ده‌که‌ن و بیروڕای جیاواز بڵاو ده‌که‌نه‌وه. کورده‌کان چێژ له‌و ئازادیانه وه‌رده‌گرن که شوێنه‌کانی دیکه‌ی عێراق لێی بێبه‌شن. له‌مه زیاتر بوونی دیاسپۆرایه‌کی تاڕاده‌یه‌ک خوێنده‌وار که ڕۆژبه‌ڕۆژ کاریگه‌ری زیاتری ده‌بێت و زیاتر له ٥٠٠ هه‌زار که‌سی له ئه‌ورووپایه، بووه به پاڵپشتێک بۆ ناسیونالیزمی کورد که له ناو ئه‌م ده‌وڵه‌ته دوفاکتۆیه‌دا گه‌شه‌ی کردووه.

شه‌ڕی ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له عێراق که سه‌دام حوسه‌ینی له ساڵی ٢٠٠٣ له‌سه‌ر ده‌سه‌ڵات لابرد، ناسیونالیزمی کوردی زیاتر له جاران به‌ره‌وپێش بردووه‌و له سایه‌ی دژایه‌تییه له مێژینه‌کانی تورکیا له‌گه‌ڵ ئه‌مریکا، ناسیونالیزمی کورد له عێراق زۆر زیاتر له‌وه‌ی که چاوه‌ڕوان ده‌کرا بوو به هاوپه‌یمانی نزیکی ئه‌مریکا (٥٠). ئه‌م بارودۆخه هه‌ستیاره له ئه‌نجامی ئه‌وه‌دا پێکهات که تورکیا ڕێگای به ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا نه‌دا خاکی ئه‌م ولاته وه‌ک پێگه‌یه‌ک بۆ هێرشکردنه سه‌ر عێراق له مارسی ٢٠٠٣ به‌کار بێنێت.

کورده‌کانی عێراق له ناکاو متمانه‌یان به ده‌وری هاوپه‌یمانی له‌گه‌ڵ ولاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا کرد و به په‌رۆش و سه‌رکه‌وتوانه ئه‌م کاره‌یان جێبه‌جێ کرد. له کاتێکدا که نائارامییه‌کانی پاش شه‌ڕی عێراق

گەلێک لە ناوچەکانی عەرەبنشینی عێراقی کردووە بە ناوچەگەلی زۆر مەترسیدار، ناوچەی کوردنشینی عێراق بووە بە هەرێمێکی تا ڕادەیەک ئارام و ناسیونالیزمی کورد بووە بە پشتیوانێکی وەفاداری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لە بەرامبەردا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە دەستووری عێراق دەکات کە دەسەڵاتێکی زۆری داوە بە کوردەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان لە عێراقدا.

ئێستا ناسیونالیزمی کورد لە عێراق خاوەن دەسەڵاتێکی بێ وێنەیە، چونکە هێزی ڤیتۆکردنی[٧٨] پێشهاتەکانی داهاتووی عێراقی هەیە. ئەگەر عەرەبەکان ڕازی نەبن بە عێراقێکی فیدراڵی دیموکرات کە ئامانجەکانی ناسیونالیزمی کورد تێیدا بەدی بێت، کوردەکان بەردەوام دەبن لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان کە لە ساڵی ١٩٩١ تا ئێستا بەڕێوەیان بردووە. لە ڕاستیدا دوو ڕیفراندۆمی نافەرمی لە ساڵی ٢٠٠٤ و ٢٠٠٥ بەڕێوەچوو کە تێیدا خەڵک بە تێکڕا دەنگی بە سەربەخۆیی کورد دا. ئەڵبەتە ڕاستییە ژیوپۆلۆتیکەکان[٧٩] لە ئێستادا ناهێڵێت کوردەکان سەربەخۆ بن، بەڵام کێ دەتوانێت پێشبینی ئەوە بکات کە داهاتوو چۆن دەبێت ئەگەر بێت و عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵ دروست نەبێت. لەوانەیە ئەوکاتە (بە ناوی پاراستنی سەقامگیری کە بە قازانجی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تورکیا و دەوڵەتانی دراوسێی دیکە بێت) مافی ئەوە بۆ کورد بە ڕەوا ببینرێت کە بەرەو سەربەخۆیی هەنگاو هەڵبگرێت.

---

veto-[78]

Geopolotical -[79]

ماوەتەوە ئەوە بڵێین کە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە کە کوردستانی گەورە خاوەن ڕێژەیەکی بەرچاوی نەوت و ئاوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، ناسیونالیزمی کورد بە دڵنیاییەوە کاریگەری لەسەر داهاتووی ناوچە بە تایبەت و داهاتووی جیهان بە گشتی دەبێت. کەوابوو دەوڵەتانی دیکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم ئەنجامانە و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەوڵەتان و نەتەوەکانی دیکە، دەبێ ڕەوایەتی بە ناسیونالیزمی کورد بدەن. ئەگەر سەرەتا دان بەم ڕەوایەتییەدا بنرێت لەوانەیە پاشان ڕێگاچارەیەکی دادپەروەرانە و درێژخایەن بۆ کێشەکان بدۆزرێتەوە.

بۆ وەدیهاتنی مافی چارەی خۆنووسین بۆ نەتەوەی کورد پێویست ناکات حەتمەن یەکپارچەیی خاکی ئەو وڵاتانە کە کورد تێیاندا دەژی، لەناو بچێت. شێوەگەلی جۆراوجۆری ئۆتۆنۆمی، فیدراڵیزم و تەنانەت دیموکراسییەکی سادە، بەڵام ڕاستەقینە لەوانەیە داواکارییە ڕاستەقینەکانی ناسیونالیزمی کورد دابین بکات. لەم ڕوانگەیە ڕێگاچارە لەوەدایە کە ڕێوشوێنە نوێکانی مافی مرۆڤ بۆ نەتەوەی کورد پەیڕەو بکرێت. ئەنجامێکی وەها لەوانەیە سەداسەد سەر نەگرێت، بەڵام دەبێتە هۆی پەیدابوونی ڕێگاچارەیەک بۆ هەموو ئەو ناسیونالیزمانەی کە پەیوەندییان بەم مەسەلەیەوە هەیە. کەوابوو داهاتووی ناسیونالیزمی کورد چۆن دەبێت، دیار نییە.

**سەرچاوە:**

**Michael M. Gunter, The Modern Origins of Kurdish Nationalism, cited in Evolution of Kurdish Nationalism, Mohammed M.A. Ahmed, Michael M. Gunter, (2007), Costa Mesa, Mazda Publishers.**

## پەراوێزەکان:


1 - John Armstrong, Nations before Nationalism (Chapel Hill: University of North Carolina, 1982).

2- Anthony D. Smith, The Ethnic Origins of Nations (Oxford: Blackwell, 1986).

3- Ernest Gellner, Thought and Change (London: Weidenfeld and Nicholson, 1964), p. 168.

4- Benedict Anderson, Imagined Communities: Reflections on the Origin and Spread of Nationalism (London: Verso, 1991).

5- Benyamin Neuberger, "State and Nation in African Thought," Journal of African Studies 4:2 (1977), p. 202.

6- Eugene Weber, Peasants into Frenchmen: The Modernization of Rural France, 1870-1914 (Stanford: Stanford University, 1976).

7- Mehrdad R. Izady, The Kurds: A Concise Handbook (Washington: Crane Russak: 1992), p. 23.

8-بنوارن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ٢٤

9- Vladimir F. Minorsky, "Kurds, Kurdistan: Origins and Pre-Islamic History," in The Encyclopedia of Islam, New ed. Vol. 5. Leiden, Netherlands: Brill, 1981), p. 449.

10- بنوارن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو

11- Edith and E. F. Penrose, Iraq: International Relations and National Development (London: Ernest Benn, 1970), p. 276.

12-بۆ بەشێ لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ زمانی ئینگلیزی بنوارن بۆ:

Prince Sharaf al-Din Bitlisi (English translation and commentaries by M. R. Izady) The Sharafnama: Or the History of the Kurdish Nation, 1597—Book One (Costa Mesa, CA: Mazda, 2005).

13- Martin van Bruinessen, Agha, Shaikh and State: The Social and Political Structure of Kurdistan (London: Zed, 1992), p. 267.

14- Amir Hassanpour, Nationalism and Language in Kurdistan, 1918-1985 (San Francisco: Mellen Research University, 1992), pp. 53, 55.

15- Ferhad Shakely, Kurdish Nationalism in Mam u Zin of Ahmad-iKhani (Brussels: Kurdish Institute of Brussels, 1992), p. 64.

16- Amir Hassanpour, "The Making of Kurdish Identity: Pre-20th Century Historical and Literary Discourses," in Abbas Vali, ed., Essays on the Origins of Kurdish Nationalism (Costa Mesa, CA: Mazda, 2003), p. 112.

17 -بنوارن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٣٠

18- David McDowall, A Modern History of the Kurds (London and New York: I.B. Tauris, 1996), p. 53.

19- John Hutchinson and Anthony D. Smith, eds. Nationalism (Oxford and New York: Oxford University, 1994), pp. 5.

جان هاتچینسۆن و ئانتۆنی ئیسمیت ئاماژە بە کۆمەڵێک ڕووداوی تایبەتی دیکە دەکەن وەک: دابەشبوونی یەکەمی پوڵەندا (لهستان) لە ساڵی ١٧٧٥، ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا لە ساڵی ١٧٧٦ و لێدوانەکەی جان فیشێر بۆ نەتەوەی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٠٧. جان هاتچینسۆن و ئانتۆنی ئیسمیت هەروەها ئاماژە بەوە دەکەن کە ناسیونالیزم وەک بزوتنەوەیەکی ئیدوئولوژیکی بێ شتگەلێک وەک چاپەمەنی ڕۆژنامەڤانی، مرۆڤگەرایی چینایەتی لە هەندێک لە شارەکانی باکووری ئیتالیا، گەشەکردنی شارە ئازادەکان وەک ناوەندی کاپیتالیزم و جیاکردنەوەی ئینگلتەرا لە فەرەنسا لە کۆتایی شەڕی سەدساڵە (١٣٣٧-١٤٥٣) ڕوینەدەدا.

20- Martin van Bruinessen, "Ehmedi Xanis Mem u Zin and Its Role in the Emergence of Kurdish National Awareness," in Abbas Vali, ed., Essays on the Origins of Kurdish Nationalism (Costa Mesa, CA: Mazda, 2003), p. 44.

21- Hugh Seton-Watson, Nations and States: An Enquiry into the Origins of Nations and the Politics of Nationalism (Boulder: Westview, 1977), p. 148.

22- Denise Natali, The Kurds and the State: Evolving National Identity in Iraq, Turkey, and Iran (Syracuse: Syracuse University Press, 2005), p. 24.

23-بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٣٠

24- Hakan Ozoglu, Kurdish Notables and the Ottoman State: Evolving Identities, Competing Loyalties, and Shifting Boundaries (Albany, NY: State University of New York, 2004), p. 117.

25-بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی٣٠. بۆ شیکردنەوەی زیاتری پرۆژەی مۆدێرنیزاسیۆنی کەمالیستەکان و ئاخێوی حکومەت بە نیسبەت کوردەکان بنواڕن بۆ:

Mesut Yegen, "The Turkish State Discourse and the Exclusion of Kurdish Identity," Middle Eastern Studies 35 (April 1996), pp. 216-29.

26- M. Hakan Yavuz, "Five Stages of the Construction of Kurdish Nationalism in Turkey," Nationalism & 2., p. 2.

27-بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ٣. بۆ زانیاری و لێکدانەوەی زیاتری ئەم بابەتە بنواڕن بۆ:

M. Hakan Yavuz, "A Preamble to the Kurdish Question: The Politics of Kurdish Identity," Journal of Muslim Minority Affairs 18:1 (1998), pp. 9-18; and

Robert Olson, "Five Stages of Kurdish Nationalism, 1880-1980," Journal of Muslim Minority Affairs 12:2 (1991), pp. 392-410.

29- Hamit Bozarslan, "Kurdish Nationalism in Turkey: From Tacit Contract to Rebellion (1919-1925)," in Abbas Vali. ed., Essays on the Origins of Kurdish Nationalism (Costa Mesa, CA: Mazda, 2003), p. 165.

30-بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

31- Ali Kemal Ozcan, Turkeys Kurds: A Theoretical Analysis of the PKK and Abdullah Ocalan (London and New York: Routledge, 2006).

32- C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs: Politics, Travel and Research in North-Eastern Iraq, 1919-1925 (London: Oxford University, 1957); and Wadie Jwaideh, "The Kurdish Nationalist Movement: Its Origins and Development," Ph.D. dissertation, Syracuse University, 1960.

33- McDowall, Modern History of the Kurds, p. 158. For further discussions, see Edmonds, Kurds, Turks and Arabs; and Saad Jawad, Iraq and the Kurdish Question, 1958-1970 (London: Ithaca, 1981). Nevertheless, Sheikh Mahmud did declare himself "king of Kurdistan" in 1922.

34- Dana Adams Schmidt, Journey among Brave Men (Boston: Little, Brown, 1964), pp. 109-10.

35- Gareth R.V. Stansfield, Iraqi Kurdistan: Political Development and Emergent Democracy (London and New York: RoutledgeCurzon, 2003).

36- Farideh Koohi-Kamali, The Political Development of the Kurds in Iran: Pastoral Nationalism (New York: Palgrave Macmillan, 2003).

37- On the Mahabad Republic of Kurdistan, see William Eagleton, Jr., The Kurdish Republic of 1946 (London: Oxford University, 1963); and "The Republic of Kurdistan: Fifty Years Later," special issue, International Journal of Kurdish Studies 11, nos. 1-2 (1997).

38- Nelida Fuccaro, "Kurds and Kurdish Nationalism in Mandatory Syria: Politics, Culture and Identity," in Abbas Vali, ed., Essays on the Origins of Kurdish Nationalism (Costa Mesa, CA: Mazda, 2003), pp. 191-217.

هەروەها بنواڕن بۆ:

Ismet Cheriff Vanly, "The Kurds in Syria and Lebanon," in The Kurds: A Contemporary Overview (London: Routledge, 1992), ed. by Philip G. Kreyenbroek and Stefan Sperl, pp. 143-70.

عیسمەت شەریف وانلی یەکێک لە چالاکە ئاکادیمیستە کۆنەکانی بواری ناسیونالیزمی هەنووکەی کوردە.

39- Martin Strohmeier, Crucial Images in the Presentation of a Kurdish National Identity: Heroes and Patriots, Traitors and Foes (Leiden and Boston: Brill, 2003), p. 54.

40- Murat Somer, "Turkeys Kurdish Conflict: Changing Context, and Domestic and Regional Implications," Middle East Journal 58 (Spring 2004), p. 237.

41- Strohmeier, Crucial Images in Kurdish National Identity, p. 45.

42-بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ٦١.

43 -بنوارِن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ٨٤.

44 -بنوارِن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٠٤.

**45- Martin van Bruinessen, "Shifting National and Ethnic Identities: The Kurds in Turkey and the European Diaspora," Journal of Muslim Minority Affairs 18 (April 1998), p. 39.**

**46- Murat Somer, "Failures of the Discourse of Ethnicity: Turkey, Kurds, and the Emerging Iraq," Security Dialogue 36 (March 2005), p. 114.**

**47- Natali, Kurds and the State, p. 161.**

48 -بنوارِن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٤٥-١٤٦

49 -بنوارِن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٦٩

50 -بۆ دوو کۆمەڵە وتاری جیاواز لەم پەیوەندییەدا بڕوانن بۆ :

**Mohammed M.A. Ahmed and Michael M. Gunter, eds., The Kurdish Question and the 2003 Iraqi War (Costa Mesa, CA.: Mazda, 2005); and Brendan OLeary, John McGarry, and Khaled Salih, eds., The Future of Kurdistan in Iraq (Philadelphia: University of Pennsylvania, 2005).**

# ڕۆشنبیران و کێشەی ژن، پەروەردە و زمان لە ئاخێوی ناسیونالیستی کورد لە قۆناغی کۆتایی ئیمپراتۆری عوسمانیدا

جانیت کلاین

تێبینییەکی سەرنجڕاکێش، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە بڵاڤۆکی "ژین"دا بڵاوبووەوە کە ڕۆژنامەیەکی کوردی ناسیونالیستی بوو، کە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی لە ناو ئیمپراتۆری عوسمانیدا بڵاو دەبووەوە. لەم ڕۆژنامەیەدا نووسرابوو:

"هەندێ لە خوێنەرەکانمان لەکاتی وتنی (گۆکردنی) وشەی "ژین" کۆمەڵێک کێشەیان هەیە و هەندێکیان واتێگەیشتوون کە ئەم وشەیە"ژن"ـە. بەهەرحاڵ وشەی ژین بەتەواوی هاوتایە لەگەڵ ژیان، چونکە لە ڕاستنویسدا پیتی(Y) واتا ئی لە نێوان(J) ،(ژ) و(N) (ن)دا دێت، بە واتایەکی دیکە وەک کەسرەی پێناسە وایە. ژن کە هاوتا فارسییەکەی دەبێت بە"زەن" بێ (Y) دەنووسرێت و بە کەسرە دەخوێندرێتەوە. ئەمە نموونەیەکە کە نیشانیدەدات کۆمەڵێک واتای نامۆ و چەوت بەهۆی

هەڵەیەکی بچووک لە نووسینی پیتەکاندا دروستدەبێت، ئەمەش بەڕاستی جێگای داخە. بەڵام چیمان پێدەکرێت؟ ئەمە نیشانیدەدات کە چەندە باشە زمانێکی ئاریایی (وەکو کوردیـ وەرگێڕ) بە ئەلفوبێی سامی بنووسرێتەوە- سەرکەوتوو بن" (١).

لە کاتێکدا کە زۆر بە دەگمەن دوو وشەی "ژن" و "ژیان" لە ڕاستنویسی نائیستانداردا پێکەوە تێکەڵ دەکرێن، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوە تەنها بەخت و شانس نەبووە کە ڕۆشنبیرانی کورد مەسەلەی ژنیان کرد بە دەستمایەی ئاخێوە ناسیونالیستییەکان کە لە سەرەتای سەدەی ٢٠دا دەستی بە گەشە کرد. ژنان خەباتی خۆیان لە قۆناغی نوێی سیاسی کورد لە سەردەمی عوسمانی لە ١٩١٣ دا لە کاتێکدا دەستپێکرد کە نووسەرێکی کورد خوێنەرانی خۆی ئاگادار کردەوە کە کێشەیەکی گرنگ هەیە کە لە سەراسەری ڕۆژئاوا و بەشێکی بچووک لە ڕۆژهەڵات، ڕۆژنامەوانان، سەرجەم زانستڤانە کۆمەڵایەتییەکان و بە کورتی هەموو کەسێکی بە خۆوە سەرقاڵ کردووە، ئەویش "کێشەی ژن"ـە. لە ڕاستیدا ئەم نووسەرە نووسی: "هەندێک بیرمەند، سەردەمی ئێمە و سەدەی ئێمە بە "سەدەی ژن" ناوزەد دەکەن. بابەتی ئێمە"کێشەی ژن"ـە لە نێوان کورددا. ئامانجی ئێمە ئەوەیە کە "کێشەی ژن" و کەوابوو کێشەی بنەماڵە بخەینەڕوو کە مەسەلەیەکی یەکجار گرنگە بۆ کورد، هەروەها کە بۆ هەموو کەسێکی دیکە گرنگە و دەبێت وەک کێشەی گەنجان گرنگی پێ بدرێت" (٢).

سەرهەڵدانی ژن و بە واتایەکی دروستتر "کێشەی ژن" لە ناو ئاخێوی سیاسی کورد لە سەرەتای سەدەی ٢٠دا ڕووداوێکی گرنگ بوو، نەک تەنها

بەهۆی ئەوەی کە نیشانەی دروستبوونی فیمینیزمی کورد بوو، یا بەهۆی ئەوەی کە نیشانەی دەرکەوتنی ژنان لە ناو سیاسەتی کورددا بوو، بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵێک کێشە و ئەکتەری نوێ. ئەم کێشە و ئەکتەرە نوێیانە پێکەوە بەشێک بوون لە جۆرێک ئاخێوی سیاسی جیاواز کە ڕۆشنبیرانی کوردی عوسمانی بڵاویان دەکردەوە و پشتیوانییان لێدەکرد (٣). ئەمە ئاخێوێکی نوێ بوو کە خۆی پەروەردە بوو و هەوڵیدا یارمەتی زیاتر بە پێکهاتنی ئاڵوگۆڕ لە واقیعی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووریدا بدات (٤).

بە نیسبەت کورد، هەروەک گەلێ لە بزوتنەوە ناسیونالیستییەکانی دیکەی هاوچەرخ ،"کێشەی ژن" و تەنانەت خودی ژنیش دەوری زۆر گرنگی نەبوو، بەڵکو بابەتێک بوو کە زۆرتر پیاوان بڕیاریان لە سەر گرنگییەکەی دەدا و سمبولی مەسەلەکانی دیکە بوو، واتا گۆڕەپانێک بوو بۆ خەبات لە پێناو کۆمەڵێک پرسی بەرفراوانتر کە کۆمەڵگە لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو بوو. کەوابوو ئەم وتارە بە واتای ڕاستەقینەی خۆی دەربارەی ژنی کورد نییە، کەوابوو ناتوانێت ڕاستەوخۆ لە چوارچێوەی توێژینەوەکان دەربارەی ژن پۆلێن بکرێت (٥)، بەڵکو دەیەوێت لە ڕێگای شیکردنەوەی شێوەی هەڵسوکەوتی ئاخێوی ناسیونالیستی کورد لەگەڵ "کێشەی ژن"، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە جنسییەکان (لە ڕووی جنسی ژن و پیاوەوە) بخاتەڕوو، بە تایبەت ئەو بوارە کە تێیدا گروپێکی بژاردەی تا ڕادەیەک بچووکی (زۆرتر پیاوان) کوردی عوسمانی هەوڵیاندا بزوتنەوەیەکی ناسیونالیست دروستبکەن و بانگەشەی ڕێبەرایەتیکردنی ئەم بزوتنەوەیان دەکرد لە ڕێگای کۆمەڵێک پرۆژەی ڕێکخراوەیی و نووسیندا.

کەوابوو مەبەستی ئەم توێژینەوەیەی ئێمە ئەوەیە کە نیشانیبدات و ئەوە شیبکاتەوە کە چۆن "کێشەی ژن" کەوتە ناو ڕۆشنبیران و ڕۆشنبیران چۆن هەڵسووکەوتیان لەگەڵ ئەم مەسەلەیە کردووە و هەروەها دەمانەوێت ئەوە نیشانبدەین کە کام لایەنەکانی مێژووی کۆمەڵایەتی و سیاسی کورد لە کۆتایی سەردەمی عوسمانیدا دەکرێت لە ڕێگای تاوتوێکردنی "کێشەی ژن" لە چاپەمەنییەکانی کوردی سەردەمی عوسمانیدا دیاری بکرێت(٦). بۆ گەیشتن بەم مەبەستە پێویستە تەوەرەکان دەربارەی ژن لە دوو بواری پەیوەندیداردا بخەینە بەر باس: یەکەم، دەبێ ئەو وتارانە بخەینە بەر باس کە دەربارەی کێشەی ژن لە پاڵ وتارە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی دیکەدا بڵاو بوونەتەوە (٧). دووەم، پێویستە ئاماژە بە پەیوەندییە ناوخۆییەکانی ئەم مەسەلانە بکەین و بیانخەینە ناو چوارچێوەی مێژوویی بەرفراوانتری خۆیاندا. ئەگەر "کێشەی ژن" وەک بەشێک لە ئاخێوێکی سیاسی بەرفراوانتر تاوتوێ بکەین، دەتوانین پەی بەوە ببەین کە "کێشەی ژن" بە شێوەیەکی ئاڵۆز پێچرابوو بەو کێشە گەورەترانەوە کە کۆمەڵگەی کورد لە کۆتایی قۆناغی عوسمانیدا لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو بوو وەک مەسەلەی ئایین، ئاراستەی شارستانییەت، ئابووری و لە هەموویان گرنگتر مەسەلەی ناسیونالیزم.

سێیەم، کاتێک کە باسی ئەوە دەکەین کە کەی و چۆن کێشەی ژن لە ناو چاپەمەنی کوردیدا سەریهەڵدا، دەتوانین پەی بەوە ببەین کە ئەوکاتە نەک تەنها کۆمەڵێ کێشە هەبووە کە ڕۆشنبیران و پیاوانی حکومەت لە قۆناغی مەبەستی توێژینەوەکەی ئێمەدا (١٩٠٨-١٩١٩) باسیان کردووە، بەڵکو سروشتی ئەو سیاسەتانە کە تێیدا تێوەگلابوون، خۆیشی لە ناو

ڕەوتی گوزار (تێپەڕبوون)دا بوو. سەرهەڵدانی ناسیونالیزم، یەکێ لە بەرهەمە لاوەکییەکانی ئەم جۆرە سیاسەتە نوێیانە بوو. ناسیونالیزمی کورد (هەر وەک بزوتنەوە ناسیونالیستییە جۆراوجۆرەکانی ناو و دەرەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی) لە دەوروبەری سەرەتای سەدەی ٢٠دا سەریهەڵدا. لەهەمان کاتدا سەرهەڵدانی ئەم ناسیونالیزمە (هەر وەک بزوتنەوە ناسیونالیستەکانی دیکە) و لێکچوونی تەواوی زۆربەی ئەم ئاخێوە - کە ئەندازیارەکانی بەرهەمیان هێنا- لەگەڵ بزوتنەوە ناسیونالیستەکانی دیکە، بێگومان ئەم ناسیونالیزمە دەخاتە ناو مێژووی جیهانی ناسیونالیزم.

لە هەموو ئەمانە زیاتر، بە نیسبەت مێژووی ڕۆشنبیری، گەلێ لە بیرۆکەکانی ئەمڕۆ دەربارەی زمان، ڕەگەز، شارۆمەندی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و زانست بۆ پەروەردەکردنی خوێنەران لە گەلێ لە شوێنەکانی جیهان، لە بەردەستدا بوو. بەهەرحاڵ ئەوە کە چۆن ئەم مەسەلانە لە لایەن چالاکانی کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانەوە شرۆڤە کراوەو کەڵکی لێ وەرگیراوە، بابەتێکی دیکەیە. لەهەمان کاتدا ئەڵبەتە ناسیونالیزمی کورد خاوەن تایبەتمەندی مێژوویی خۆیەتی.

ناسیونالیزمی کورد لە ناوەڕاستی ئاڵوگۆڕە چڕە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی کوردستانی عوسمانیدا سەریهەڵدا، کە مەرجی یەکلاییکەرەوەی، گۆڕینی پێکهاتەی دەسەڵاتی ناوچە بوو کە تا ڕادەیەک لە ئەنجامی هەوڵەکانی عوسمانی بۆ چڕکردنەوەی ناوچە لەیەک دوورەکانی ئیمپراتۆرییەکەی لە سەدەی ١٩دا ڕوویدا. ناسیونالیزمی کورد تا ڕادەیەک لە ئەنجامی هەوڵەکانی گەورە پیاوە محەللییەکان سەریهەڵدا کە دەسەڵاتیان لەم ڕەوتەدا لێ زەوت کرابوو. هەندێک لەم گەورەپیاوانە بەو

ئامانجە ڕوویان لە ناسیونالیزم کرد کە ڕێگایەکی دیکە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات بدۆزنەوە. لەهەمان کاتدا کەسانی سەر بە چینی خاوەن پیشە (وەک ڕۆژنامەنووس، پزیشک، پزیشکی ئاژەڵ، و ئەفسەر) کاتێک هاتنە ریزی ئەو گەورەپیاوانە کە کۆمەڵگەی عوسمانی بە گشتی لە ناو ڕەوتی ئاڵوگۆڕێکی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی نوێدا (مۆدێرنیتە) بوو و پرەنسیپی ناسیونالیزم ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەبوو بە چوارچێوەیەکی ڕەوا بۆ هاندانی ئامانجە سیاسییەکان. هەروەها کە نەتەوە بە شێوەیەکی بەرفراوان پەیوەندی بە دامەزراوە نوێیەکان و پێشکەوتنەوە هەبوو، ناسیونالیزمیش بەشێک بوو لە پرۆژەیەکی ڕۆشنبیری گەورەتر کە بە بڕوای گەلێک لە ڕۆشنبیران، کۆمەڵگەکەیانی خۆشبەخت دەکرد (٨).

بیرمەندانی کورد بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی بیرو بۆچوونەکانیان لە نێو هاوڕێ عوسمانییەکانیاندا، بە تایبەت هاوڕێ کوردەکانیان کە لە قەڵەمڕەوی عوسمانی و لە ئەوروپا دەژیان، گەلێ بڵاڤۆکیان بڵاو کردەوە کە زۆربەیان دوو زمان بوون و کۆمەڵێک وتاریان دەربارەی تەوەرگەلی جۆراوجۆر هەم بە زمانی کوردی و هەم بە زمانی تورکی عوسمانی بڵاو دەکردەوە. لەم بڵاڤۆکانەدا کۆمەڵێک بابەت وەک دەوری ئایین لە ناو کۆمەڵگە، پێشکەوتنە زانستییەکان، مێژوو، ئەدەبیات، سیاسەت، ڕووداوگەلی ڕۆژ، ناسیونالیزم، پەروەردە، چاکسازی لە زمان و "کێشەی ژن" تاوتوێ دەکرا. ئەم بڵاڤۆکە کوردیانەی سەردەمی عوسمانی لە ڕووی شێواز و ناوەڕۆکەوە تەنها زۆر لە بڵاڤۆکە هاوشێوەکانی دیکەی عوسمانی دەچوون، بەڵکو زۆریش لەو بڵاڤۆکانە دەچوون کە ناسیونالیستەکان و بیرمەندانی کۆمەڵگەکانی دیکەی سەراسەری جیهان بڵاویان دەکردنەوە. لەم ڕووەوە ئەم بڵاڤۆکە کوردییانە

بێ هاوتا نەبوون و بەشێک بوون لە ڕەوتە تەکنۆلۆژیکە گەورەترەکانی جیهان (بۆ نموونە کاپیتالیزمی چاپ) (٩)و ڕەوتە ڕۆشنبیرییەکان. بەهەرحاڵ تایبەتمەندی ئەم بڵاڤۆکانە تەنها ئەوە بوو کە بە زمانی کوردی بڵاو دەبوونەوەو بە زمانی کوردی دەنووسران و لە ڕووی سیاسییەوە باسی کوردیان دەکرد و تاڕادەیەک باسی ئەو مەسەلانەیان دەکرد کە بە تایبەت کاریگەریی لە سەر کوردەکان هەبوو(١٠).

لە هەموو هەوڵدانێک بۆ شیکردنەوەی هەرچەشنە ئاخێوێکی کۆمەڵایەتی یا سیاسی (بۆ نموونە ئاخێوی ناسیونالیستی. ئێمە لەم وتارەدا) ئەوە گرنگە کە ئەو مەسەلە سەرەکییانە تاوتوێی بکەین کە خودی ناسیونالیستەکان وزەیەکی زۆریان بۆ سەرف کردووە، واتا ئەو بابەتانە کە بەردەوام لە بلاَڤۆکەکانیاندا بڵاو بووەتەوە. بە نیسبەت چاپەمەنی کوردی، من هەوڵمداوە لە شوێنێکی دیکەدا باسی ئەم پرۆژەیە بکەم و لێرە دووپاتی ناکەمەوە (١١). بەهەرحاڵ لەهەمان کاتدا لەوانەیە شایانی بایەخپێدان بێت کە ئەو بابەتانە شیبکەینەوە کە لە پێوەرێکی کەمتردا لە چاپەمەنییەکاندا بڵاو بوونەتەوە، چونکە ئەم تەوەرانە، بە تایبەت هاوکاتبوونیان لەگەڵ مەسەلەکانی دیکە لەوانەیە ئەو تێڕوانینانە ڕوونتر بکاتەوە و لە ڕاستیدا گەلێ لە ڕوانگە و پلانە وردترەکانی ناسیونالیستەکان ئاشکرا بکات."کێشەی ژن" یەکێ لەم تەوەرانەیە. "کێشەی ژن" هەرچەند کە کەمتر لە گەلێ لە تەوەرەکانی دیکە باسکراوە، بەڵام بەهەرحاڵ پشتگوێش نەخراوە. هەروەها کە من هیوادارم بتوانم لەم وتارەدا نیشانیبدەم "کێشەی ژن" پەیوەندییەکی نەپساوەی لەگەڵ کێشە گەورەترەکاندا هەبووە و کەوابوو شایانی ئەوەیە کە باش سەرنجی پێبدەین.

## مەسەلەی "نوێ "و "مۆدێرن"

ساڵی ١٩١٣ "کێشەی ژن" وەک مەسەلەیەکی گرنگی کۆمەڵایەتی و کێشەیەک کە چارەسەرکردنی دەبێتە هۆی پێشکەوتن، نوێبوونەوە و بەختەوەری و لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی بە نەتەوەبوونی کورد، کەوتە ناو چاپەمەنی کوردی. هەروەها کە نووسەرێک ئەو کاتە نووسی: "یەکێ لە پێوانەکانی شارستانییەت، پێگەی ژنە لە ناو کۆمەڵگەدا و ڕێژەی سەرکەوتنی لەناو کۆمەڵگەدا. لە ناو نەتەوە شارستانییەکاندا، ژن بەڕاستی نیوەی کۆمەڵگەیە و هەموو جۆرە ماف و ئیمتیاز و ڕێزگرتن و گرنگی پێدانێک کە پیاو هەیەتی، تەنانەت هەندێجار زیاتر لە پیاویش دەدرێت بە ژنان" (١٢).

ئەو نووسەرانەی کە دەربارەی "کێشەی ژن" دەیاننووسی، دەیانگوت پێگەی ژن لە ناو کۆمەڵگە دەربڕی تایبەتمەندیی ئەو کۆمەڵگەیەیە و نووسەرانی دواتریش بە شێوەگەلی جۆراوجۆر ئەم چەمکەیان پەرەپێداوە و گەشاندووە. بەهەرحاڵ "کێشەی ژن" یەکێ لەو کێشە بچووکترانە بوو کە ڕۆشنبیرانی کوردی سەردەمی عوسمانی لە چوارچێوەی هەوڵە بەرفراوانترەکانیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرد، واتا ئەو هەوڵە بەرفراوانانە کە بۆ چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی لە ناو ئاڵوگۆڕدا و بە مەبەستی بەڕێکخستنکردنی وزەی کۆمەڵگە بەرەو عاقارێک کە ئەوان هەستیان دەکرد بە گشتی بە قازانجی عوسمانییەکان و بە تایبەتی بە قازانجی کوردەکانە، دەدرا. ڕوانینێکی کورت بۆ مەسەلەکانی

دیکە کە چاپەمەنی کورد لەو سەردەمەدا باسی دەکرد، یارمەتی دەدات بە ڕوونبوونەوەی "کێشەی ژن" لەم ئاخێوەدا.

لە ڕاستیدا ئەو مەسەلانەی کە لە چاپەمەنی کوردیدا لە کۆتایی قۆناغی عوسمانیدا باس دەکرا، نیشانگەری سێ شێوە سیاسەت بوو کە نووسەرانی پێشەنگی تورک وەک یوسف ئاکچوورا[80] و زیا گوگالپ[81] ، قەیرانی شارستانی خۆیان تێدا وەسف دەکرد (١٣) و بە شێوەی ناڕاستەوخۆ بوو بە نموونەیەک کە لە ڕێگایەوە مێژوونووسانی دواتر ، ڕەوتە ڕۆشنبیری و سیاسییەکانیان لە سەردەمی کۆتایی عوسمانیدا شیدەکردەوە .(١٤)کەوابوو باس و گفتوگۆو موناقەشە لە چاپەمەنییەکانی عوسمانیدا ئەوەندە جموجۆڵی تێکەوت کە دەیانگوت دەبێ کۆمەڵگە لەسەر بنەمای پرونسیپگەلێک وەک "ئیسلام" و "ڕۆژئاواچێتی"[82] یان "ناسیونالیزم" (مەبەستیان ناسیونالیزمی تورک بوو) بەڕێکخستن بکرێت و "یاساسەروەری"[83]، "مۆدێرنیزم" و "عوسمانیزم"یش بە سەریاندا زیاد بکرێت.

ئەم مەسەلانە لە چاپەمەنی کوردیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان باس دەکرا. لە قۆناغی ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابوورییە خێراکاندا، ڕۆشنبیرانی کورد چوونە ڕیزی هاوتا عوسمانییەکانیان بۆ گفتوگۆی گشتی دەربارەی سروشتی ئەو کۆمەڵگەیە کە ئەوان بەتەمابوون دروستی بکەن.

---

Yusuf AkÇura-[80]

Ziya Gokalp-[81]

westernism-[82]

constitutionalism-[83] (حکوومەتی یاسا)

کۆمەڵێک وتار دەربارەی دەوری ئیسلام، ڕێژەی بەرەو ڕۆژئاواچوونی کۆمەڵگە، وەرگرتنی سیستمە مۆدێرنەکان (سیستمی پەروەردە - وەک قوتابخانەی مۆدێرن، میتۆدەکانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە و مەنهەجی پەروەردە -، سیستمی سیاسی- وەک پەسەندکردنی یاسای بنەڕەتی، ناوەندچێتی یا ناوەندنەچێتی ، و سیستمی سەربازی- وەک چەکی نوێ، یاسای سەربازی و سوپا)، چاکسازی لە ئەلفوبێدا و کۆمەڵێک بابەتی دیکە کە چاپەمەنی کوردی لە سەرەتای دەستبەکاربوونی لە ساڵی ١٨٩٨دا باسی دەکرد و لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە تا ساڵی ١٩١٩ گەشەی کرد.

ئەگەرچی ئەم تەوەرانە نوێ و مۆدێرن بوون، بەڵام گرنگییەکەی لەوەدایە کە لە ڕێگای ئامرازێکی نوێ واتا چاپەمەنی دەردەبڕدرا کە سەرهەڵدانی خودی ئەم چاپەمەنییەش دەربڕی ئەو ڕاستییە کۆمەڵایەتی و سیاسیانە بوو کە لە سەروبەندی ئاڵوگۆڕدا بوون. یەکەم ڕۆژنامە و بڵاڤۆکە غەیرە حکومییەکان وەک بەرهەمی بزووتنەوەی تورکە گەنجەکانی عوسمانی لە دەیەی ١٨٦٠ دا سەریانهەڵدا، چونکە ڕۆشنبیران و کاربەدەستانی حکومەت دەستیان کرد بە باس و گفتوگۆ کردن لە سەر ئەو مەسەلانە کە پەیوەندی بە ئازادی، یاساسەروەری و بەتایبەت "عوسمانیزم"ەوە هەبوو (١٥).

لە دەیەی ١٨٩٠ کەسایەتی و ڕێکخراوگەلی جۆراوجۆر کە زۆربەیان تا ڕادەیەک لەژێر کاریگەری "کۆمیتەی یەکێتی و پێشکەوتنی عوسمانی" (عوسمانی ئیتیحاد و تەرەقی جەمعییەتی کە ئێمە لەمەودوا وەک CUP ناوی لێدەبەین) دا بوون، پێکەوە یارمەتییان بە سەرهەڵدانی

چاپەمەنییەکی زیندوو دا کە گەلێ لە کەسایەتییە خوێندەوارەکانی عوسمانی لە سەرەتای سەدەی ٢٠وە سەرقاڵی خۆی کردبوو. یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی "کوردستان" (١٨٩٨-١٩٠٢) لەم چوارچێوەیەدا سەریهەڵدا و لەژێر چاودێریCUP دا بڵاو بووەوە. دامەزرێنەرانی ئەم ڕۆژنامەیە واتا میقداد میدحەت بەدرخان و عەبدولڕەحمان بەدرخان بەشێک بوون لە بزووتنەوەیەکی گەورەتر بۆ لەسەر دەسەڵات لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و زیندووکردنەوەی یاساسەروەریی عوسمانی (حکومەتی یاسا) (١٦).

بەهەمان شێوە"کورد تەعاون و تەرەقی گازیتەسی" (بڵاڤۆکی پێشکەوتن و یارمەتیدانی کورد) کە دوابەدوای هەراوهۆریاکانی شۆڕشی تورکە گەنجەکان لە ١٩٠٨-١٩٠٩دا بڵاو بووەوە، ئەویش دەربڕی کۆمەڵێک ئاڵوگۆڕی سیاسی بەرفراوانتر بوو لە ناو ئیمپراتۆری عوسمانی و باسی کۆمەڵێک مەسەلەی گرنگتری دەکرد کە ئەو کاتە کۆمەڵگە لە گەڵیدا ڕووبەڕوو بوو. ئەم نووسەرانە لە بڵاڤۆکەکانیاندا باسی کۆمەڵێک مەسەلەی زۆر گرنگیان دەکرد کە سەراسەری ئیمپراتۆری عوسمانی لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بوو وەک چالاکییەکانی پارلمان، مەسەلەی دەستێوەردانی زلهێزەکان، بایکۆتکردنی (نەکڕینی) کاڵا و شتومەکەکانی وڵاتی نەمسا و مەسەلەی باڵکان. کەوابوو دەبێ ئەم بڵاڤۆکە کوردیانە لە چوارچێوەی بەرفراوانتری ڕووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی عوسمانیدا سەیر بکرێن. ئەم بڵاڤۆکە کوردیانە هەروەک گەلێ لە بڵاڤۆک و ڕۆژنامەکانی دیکە کە لەم قۆناغەدا لە ناو و دەرەوەی عوسمانیدا بووژانەوە، دەربڕی سروشتی نوێی سیاسەتەکانی عوسمانی و کۆمەڵگەی عوسمانی لەو سەردەمەدا

بوون (هەم لە ڕووی شێوەی دەربڕین و هەم لە ڕووی پەیامەکانیانەوە) (١٧).

لە کاتێکدا کە ئامرازی دەربڕین و پەیامەکانی ئەم بڵاڤۆکانە بە دڵنیاییەوە بەشێک بوون لە چوارچێوەی بەرفراوانتری عوسمانیدا، بەڵام بەهەرحاڵ هیچ کەس ناتوانێت لایەنی دیکەی ناوەڕۆکی بڵاڤۆکە کوردییەکان پشتگوێ بخات کە ئەویش ئەو ڕاستییەیە کە ئەم بڵاڤۆکانە کوردی بوون، چونکە ناوی کوردیان لەسەر بوو و خوێنەری کوردیان هەبوو و بە زمانی تورکی و کوردی و عوسمانی وتاریان بڵاو دەکردەوە. هەرچەند کە وتارەکانی ناو ئەم بلاڤۆکانە زۆرتر باسی ئەو کێشانەیان دەکرد کە کۆمەڵگەی عوسمانی لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بوو، بەڵام کۆمەڵێک ڕۆژنامەنووس و وتارنووس بەشدارییان تێدا دەکردن و بە تایبەت باسی کورد و کوردستانیان تێدا دەکردن. هەرچەند کە ئەم وتارانە قەد ناوی "کورد" و "کوردستان"یان نەدەهێنا، بەڵام بە شێوەی ناڕاستەوخۆ مەسەلەی کوردیان لەو بڵاڤۆکانەدا دەخستە بەرباس کە لە لایەن ڕۆشنبیرانی عوسمانی- کە خۆیان بە کورد دەزانی و خوێنەری تایبەتی کوردیان هەبوو- بڵاو دەبووەوە (١٨).

بەهەرحاڵ سەرەڕای بەهێزبوونی ئاشکرای ئەم ئاخێوە نوێیە کە هێدی هێدی ڕەنگ و بۆی نەتەوەیی بە خۆوە گرتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تایبەتمەندییە نەتەوەییەکەی لە چوارچێوە گەورەترە عوسمانییە ئیسلامییەکەیدا کەمڕەنگ ببوو و پێشکەوتنی کوردەکان وەکو کورد، خزمەتی بە ئامانجە گەورەترەکانی پێشکەوتنی خەڵکی عوسمانی و موسڵمان دەکرد. بەهەرحاڵ گۆڕانکارییەک لەم ئاقارەدا بەدیدەکرێت،

ئەویش ئەو بڵاڤۆکانە بوون کە کتوپڕ پێش هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی سەریانهەڵدا واتا "ڕۆژی کورد" (١٩١٣) و "هەتاوی کورد" (١٩١٣-١٩١٤).

وتارەکانی ئەم بڵاڤۆکانە ڕەنگ و بۆی ناسیونالیستیتریان بوو و خوێنەرەکانیان هێدی هێدی شاهیدی پێکهاتنی ئاڵوگۆڕ لە پەیوەندییەکانی نێوان پێشکەوتنی خەڵک (یا نەتەوە) و شەرت و مەرجە بەرفراوانترەکانی پێشکەوتن بوون. پێش ئەوە، نووسەران لایەنگری مۆدێرنیتە و پەروەردەکردنی کوردەکان و پێشکەوتنی زمانەکەیان وەک ئامرازێک بۆ هاندانی کۆمەڵگە و سیاسەتێکی تەندروستتری عوسمانی بوون، بەڵام پاش ئەوە دەستیان کرد بە باس و گفتوگۆ دەربارەی ئەوەی کە چۆن خوێندەواری (پەروەردە) و لایەنەکانی دیکەی مۆدێرنیتە دەکرێت بخرێتە خزمەتی ئامانجی نەتەوەیی کورد و کوردایەتی.

ئەم گۆڕانکارییە لە ئامانجەکاندا لەوانەیە یارمەتی بە شرۆڤەکردنی ئەو پرسیارە بدات کە بۆ کێشەی ژن لە باتی ئەوەی ساڵی ١٨٩٨ یا ١٩٠٨ سەرهەڵبدات، لە ساڵی ١٩١٣ سەریهەڵدا (١٩). هەروەها کە هیوادارم لەم وتارەدا نیشانیبدەم، کێشەی ژن لەسەر بنەمای ئاخێوێکی ناسیونالیستی نوێ سەریهەڵدا و لە سەرەتاوە واتا ساڵەکانی پێش هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی تا قۆناغی دوای شەڕ، واتا ئەو کاتە کە هەردوو مەسەلەکە ڕۆژبەڕۆژ گرنگی زیاتری پێدەدرا و دەخرایە بەر باس و تاوتوێکردن، پەیوەندییەکی گەرموگوڕی هەبوو لەگەڵ مەسەلەی نەتەوەییدا.

## ناسیونالیزم و "کێشەی ژن"

دکتۆر عەبدوڵڵا جەودەت[٨٤] ساڵی ١٩١٣ نووسی:

" ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە بڕیار لە سەر چارەنووسی نەتەوەکان دەدرێت و بە فەرمی دەناسرێن" (٢٠) و باسی شتێکی کرد کە پاش شەڕ ڕوونتر بووەوە، ئەویش ئەوە بوو کە خەڵک و دەسەڵات لە جیهاندا زیاتر لە سەر بنەمای پرەنسیپی نەتەوەیی بەڕێکخستن دەکرێن. ڕۆشنبیرانی کورد ڕۆژبەڕۆژ زیاتر ئاگاداری گرنگی ئەم نەزمی (ئاژینی) نوێیە جیهانییە دەبوون و بەهۆی ئەوەی لەخەباتێکی بەرفراوانتردا بۆ دەسەڵات بەشدارییان دەکرد، وشەی تازە ڕەوایەتی پێدراوی"ناسیونالیزم"یان بۆ دەربڕینی باس و گفتوگۆ سیاسییەکانیان و پێشخستنی ئاڵوگۆڕەکان بەکار دەهێنا. لە ئاخێوی نەتەوەییدا بوو کە سەرجەم ئەو مەسەلانەی کە مۆدێرنیتە و پێشکەوتنیان گەمارۆ دابوو، هاوئاهەنگ کران.

ڕۆشنبیرانی کورد هەستیان دەکرد کە پێویستە وەکو نەتەوە بچنە ناو مۆدێرنیتە، چونکە نەتەوە خاڵی سەرەکی هەبوونی سیاسی لە جیهانی مۆدێرندابوو. لەگەڵ ئەمەشدا، لەهەمان کاتدا بۆ ئەوەی کوردەکان وەکو نەتەوەیەک بە فەرمی بناسرێن و مافە نەتەوەییەکانیان بەدەست بهێنن، پێویست بوو ڕۆشنبیرەکانیان هەستی ناسیونالیستی لە ناو خودی کوردەکاندا بوروژێنن و لەهەمان کاتدا بە هێزەکانی جیهان بسەلمێنن کە مەسەلەی نەتەوەیی کورد ڕاستییەکی بەرچاوە و کورد وەکو نەتەوەیەک خاوەن هەموو تایبەتمەندییەکانی پێشکەوتن و مودێرنیتەیە.

---

84- Abdullah cevdet

ڕۆشنبیرانی کورد پرۆژەی ناسیونالیستی و چاکسازی جۆراوجۆریان گرتە بەرو لە ڕێگای وتارەکانیان کە لە چاپەمەنییەکاندا بڵاو دەبووەوە، ئەم پرۆژەیەیان بۆ خەڵک دەخستەڕوو و تێیدا هەوڵەکانی بەشێک لە نوخبە کوردەکانیان دەخستەڕوو بۆ دروستکردنی ناسیونالیزمی کورد و چاکسازی لە ناو ئەم ناسیونالیزمەدا، لە پاڵ هێڵە مۆدێرنەکاندا. ڕۆشنبیرانی کورد هەوڵیان دەدا هێزەکانی جیهان تێبگەیەنن و (هەروەها هێزەکان دان بەوەدا بنێن) کە کوردەکان نەتەوەیەکی جیاوازن و شایانی ئەوەن وەک نەتەوەیەک هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت و بە هەموو تایبەتمەندییەکانی سەردەم تەیار بکرێن. ناسیونالیستە کوردەکان پێش شەڕی یەکەمی جیهانی دەستیان کرد بە وتار نووسین دەربارەی ئەم بابەتانە (هەروەها کە لە قسەکانی عەبدوڵلا جەودەت) دا بینیمان، بەڵام لە ڕاستیدا پاش شەڕی یەکەمی جیهانی و ڕاگەیاندننامە ١٤ خاڵییەکەی وودرۆ ویلسۆن (٢١) بوو کە بەشێکی گرنگی نوخبە کوردەکان هاندران تا هەوڵبدەن بۆ بەدەستهێنانی بەشێک لەو (سەرزەمینانەی – وەرگێڕ) ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە پاش شەڕ دابەش کران. پێشکەوتنی ژنی کورد وەک هۆکاری سەرەکی بۆ گەیشتن بە دوو ئامانجی نەتەوایەتی کورد و پێشکەوتنی مۆدێرن سەیر دەکرا، هەروەها کە بیرمەندێکی کورد لەو سەردەمەدا نووسی: "پێگەی ژن لە ناو هەر نەتەوەیەکدا دەربڕی ڕێژەی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگەیەیە. ڕێژەی پێشکەوتوویی نەتەوەکەمان و خەڵکەکەمان بەستراوەتەوە بە پێگەی ژنەوە. ئەم یاسایە دەبێ هەموو کاتێک لەبەرچاو بگیرێت" (٢٢).

ڕۆشنبیرانی کورد بە تێگەیشتن لە کاریگەری یەکلاییکەرەوەی "کێشەی ژن" لە جیهانی مۆدێرندا، لایەنگری چاکسازی بوون بۆ ئەوەی ژنانی کورد و بنەماڵەکان و لە ئەنجامدا نەتەوەی کورد لەگەڵ ڕێوشوێنەکانی سەردەم خۆیان بگونجێنن. گرنگترین بواری ئەم چاکسازییە، بواری پەروەردە بوو. لە ساڵی ١٩١٣ نووسەرێکی کورد پێشنیاری ئەوەی کرد کە ژنانی کورد تا ئەو ئاستە فێری خوێندن و زانست بن کە شیاوی کەسایەتی ژنە" (٢٣).

نووسەرانی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی پێداگرییان لەسەر پێویستبوونی بەرفراوانکردنی پەروەردەیەکی ڕۆشنبیرانەو مۆدێرن بۆ ژنان دەکرد (٢٤) و وەک هۆکاری سەرەکی بۆ چاکسازی لە ناو ژنان و کەوابوو یارمەتیدان بە وەدیهاتنی ئامانجی نەتەوەیی و پێشکەوتن سەیری پەروەردەیان دەکرد. بە هەرحاڵ لەهەمان کاتدا ئەم پێداگرتنە لەسەر پەروەردە و ڕۆشنبیری (واتا مۆدێرنیتە) نەک تەنها بۆ ژنان داوا دەکرا، بەڵکو بۆ کۆمەڵگە بە گشتی و بە تایبەت بۆ گەنجانی کورد و توێژ و چینە خوارەکانی کۆمەڵگەی کورد وەڕاست دەگەڕا. لە کاتێکدا کە زۆربەی ڕێکخراوە کوردەکان لە قۆناغی کۆتایی عوسمانیدا زیاتر بۆ "ڕۆشنبیرکردنی گەنجانی کورد"دامەزرابوون، بەڵام هەڵسوڕاوانی پاش جەنگ بە گرنگیی زیاترەوە باسی دەوری پەروەردەیان لە نەتەوەسازیدا دەکرد و دەیانگوت نەک تەنها پەروەردە، بەڵکو پەروەردەی "نەتەوەیی" تایبەت لە هەموو ئەرکێکی دیکە گرنگترە، هەروەها کە بیرمەندێکی ناسیونالیست ئەو کاتە نووسیبووی: "هەروەها کە هیچ کەس ناتوانێت بێ خواردن بژێت، هیچ نەتەوە و وڵاتێکیش ناتوانێت بێ پەروەردە بژێت". (٢٥).

پەروەردە شتێکی بنەڕەتی بوو بۆ ئامانجە پەیوەندیدارەکانی پێشکەوتنی مۆدێرن و نەتەوەسازی، هەروەها کە لە کۆمەڵگە، پرۆگرام و پلانە جۆراوجۆرەکانی پەروەردە و هەروەها داخوازییە گشتییەکانی ڕۆشنبیرانی کورد بۆ پەرەپێدان و پێشخستنی فێرکردن و پەروەردەدا دیار بوو (٢٦). پەروەردەی ژنان و کچان لەم چوارچێوە بەرفراوانترەی پەروەردەی نەتەوەییدا هاتە ئاراوە.

لە کاتێکدا کە ڕوونە کوردە ناسیونالیستەکان دانیان بە گرنگبوونی پەروەردەی ژنان بۆ مان و بەختەوەری نەتەوەی کورددا دەنا، پێداگریشیان لەسەر دەوری زۆر بنەڕەتی ژنی کورد هەم لە بواری"هۆشیاری نەتەوەیی" و هەم لە بواری ژیانی نەتەوەییدا بە گشتی وەک مامۆستایەک دەکرد. مەبەست لە مامۆستا، مامۆستای قوتابخانە نەبوو، بەڵکو مەبەستیان زۆرتر دایکێک بوو کە منداڵەکانی بە شێوەیەکی بێ وێنەی کوردی گەورە بکات. کوردە ناسیونالیستەکان زۆر بە ڕوونی پێداگرییان لەسەر دەوری ژن لە پەروەردەکردنی نەتەوەدا دەکرد. نووسەرێکی کورد بیروبۆچوونی لەو کاتەدا ئەوە بوو کە: "ژن بنەمای نەوەکانی داهاتوو دادەڕێژێت. ئەمە بە واتای ئەوەیە کە ئەو نەتەوانەی کە ژنەکانیان باش پەروەردە نەکردووە و ڕێز لە ئەرکی دایکایەتی ناگرن، خۆیان هەتیون" (٢٧).

ئەم نووسەرە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە: "ژنی کورد، ژنی بەخێوکردنی منداڵە و تەنها کەسێکە کە پەروەردە بە منداڵ دەدات و لە دەروونی (ڕۆحی) هەموو منداڵێکی کورددا شتێک هەیە کە تێکەڵە لەگەڵ جەستە و دەروونی دایکیدا" (٢٨). ئەم نووسەرە پێداگری لەسەر ئەوە

دەکرد کە پێویستە ژن پەروەردە بکرێت بۆ ئەوەی دایکێکی باش و نەتەوەیی بێت (٢٩). نووسەر هەروەها مۆچیاری خوێنەرانی دەکرد کە ئەگەر ئەو ڕێوشوێنە پەروەردەیی و فێرکاریانەی کە لە وتارەکەیدا باسی کردووە، جێبەجێ بکرێت، ئەو کاتە دەبینن کە "ژنی کورد"چەندە داوێنپاک و باشە و ئەو منداڵانەی کە گەورەی کردوون، چەندە دەتوانن بنەمایەکی باش بۆ وڵاتەکەیان دابڕێژن" (٣٠).

"کۆمەڵەی پێشکەوتنی ژنی کورد" (کورد کادینلاری تەعالی جەمعییەتی[85]) وەک لقێکی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان (کوردستان تەعالی جەمعییەتی) لە ساڵی ١٩١٩ دا دامەزرا بۆ ئەوەی ژنان لە ڕەوتی هۆشیاری نەتەوەییدا بەشدار بن. عەزیز یامولکی[86] لە وتارێکدا بە بۆنەی کردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە پیرۆزبایی لە ژنان دەکات و پێداگری لەسەر بەرپرسیارێتی ژنان وەک دایکێکی مامۆستا دەکات و دەڵێت:

"ژنی کورد لەم قۆناغە دواییانەی مێژووی پێشکەوتن و گەشەکردنی گەورەدا، لاپەڕەیەکی پرشنگداری تۆمار کردووە کە پێشتر بۆ ماوەیەک بە دەستی ئەو گیرو گرفتانەی کە سەردەم بە سەریدا سەپاندبووی، گیرۆدە بوو و دەبێ بە چاوی ڕێز و گەورەییەوە سەیر بکرێت، چونکە وەک هەموو نەتەوەکانی دیکە، گرنگترین جەمسەری پێشکەوتن و گەشەسەندنی شارستانییەتی کورد بەستراوەتەوە بە پێشکەوتن و گەشەکردنی ژنەوە. وەدیهاتنی ئەم ئامانجە بەو منداڵانە گرێدراوە کە ژنان گەورەیان دەکەن. منداڵ ئەدای ئایینی و نەتەوەیی و دابونەریتی نەتەوەیی لە داوێنی دایکی

---

Kurd kadinlari teali cemiyeti-[85]

Eziz yamulki -[86]

فێر دەبێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو منداڵە پاشان تیکەڵ بە ڕەگەز و نەتەوەی خۆی بێت و وەفادار بێت بە نەتەوەکەی خۆی کە ٦ هەزار ساڵ مێژووی هەیە. بۆ ئەوەی ئەم ئامانجە وەدی بێت، ئەوانەی کە داوێنپاکن و دەیانەوێت خزمەتی خۆیان بکەن، بەربەستێک لە بەرامبەر ئەو هۆکارە ڕوخێنەرە دروستدەکەن کە ساڵەهای ساڵە نیشتمانەکەمان لە گەڵیدا ڕووبەڕوویە و ئەو ئێش و برینە قوڵ و کوشندانە سارێژ دەکەن کە ئازارمان دەدات، کەوابوو هەوڵێکی ماندوونەناسانە و نەپساوە دەدەن" (٣١).

وتارێکی دیکە ستایشی هەوڵەکانی کۆمەڵگە بۆ پێشکەوتنی ژنانی کورد دەکات و ئاماژە بە پەیوەندی پەروەردە و دایکایەتی نیشتیمان و مەسەلەی نەتەوەیی دەکات و بە شێوەیەکی ڕوون دەڵێت: "ئەگەر دەمانەوێت پێگەیەکی بەهێزمان هەبێت کە لە ڕێگایەوە دەنگی خۆمان بگەیەنین بە جیهانی شارستانی، دەبێ لە زانست، هونەر، تەکنۆلۆژی و هەموو شێوازەکانی دیکەی پێشکەوتن کە لە ئەمریکا بگرە تا ئەورووپا هەیە، کەڵک وەربگرین و لایەنە باشەکانی بخەینە خزمەت ئەو شتە نەتەوەییانەی کە لە ناو خۆماندا هەیە و کەڵک لەو شتانە وەربگرین کە لە ناو نەتەوەی خۆماندا نییە. هیچ شتێک بە قەد ئەوە خزمەت بە پێشکەوتنی ئێمە ناکات کە ژنانی ئێمە قەدری ئەم ڕاستییە بزانن. ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە ژنانی ئێمە خۆیان بنوێنن، بەڵکو ئەوەیە کە بە تێڕوانینێکی نوێ، گەشە و پێشکەوتنی ژنانی کورد مسۆگەر بکەن و ڕۆژێک بێت کە هەموو ژنێک لە بنەماڵەی خۆیدا ببێت بە دایکێک کە

هەستی نیشتمانپەروەری، بەرپرسیارێتی و فیداکاری فێری منداڵان و خۆشک و براکانمان بکات . (٣٢)

"عبدالرحیم رحمی"[٨٧]ی شاعیریش (لە پارچە شیعرێکدا لەژێر ناوی "بۆ جڤاتا دایکان: ژ ماڵا هەکاریان") پیرۆزبایی لە کرانەوەی کۆمەڵەی ژنانی کورد دەکات و ئاماژە بە دەوری نیشتمانپەروەری دایکان دەکات و دەڵێت:

پرسی ژ عەسر دەوران: فەن و تەرەقیاتە
دەوڵەت سرِی چییە؟ گوت:
دەوڵەت سرِی ژنانە
لەورە قەد ناخەون ئەو شەو و رۆژ ئەوان خەباتە
جا زاریەکی مەزن کن: ژینا وەڵات بەوانە
ئینسان بە ئەسڵی فیترەت نە قەنجە نە خرابە
قەنج و خرابیا مە بەراکرنە دیانە
ئەمری رەسوولی جینەت: بن پێ ئومەهاتان
لەورا دەها زەکاوەت بە تەربیا ئەوانە
عیلم، فەزیلەتا وان هندی بکەت تەرەقی
تەجهیز بین موکەمیل بە ئەخلاق مادەرانە
ئەم دی بلەند بین هیند حەتا بکهنە ئەو جان
وەختی فەلاح بونێ زمان ژی ئەو زمانە
گوتن و کرنە دایان جڤاتەکی بلەندی

---

[87]- Ebdurrahim Rehmi

یا ڕەب تۆ پێکڤە بینە تەوفیٚقێکی دوانە
رحمی نەدیت کو لایق تەقدیم بکەت هەدییە
هەدییە گەر قبوڵ بیت، وی دایە جیسم و جانە[88] (٣٣)

بۆ ئەوەی پەروەردە، بە تایبەت پەروەردەی نەتەوەیی سەرکەوتوو ببوایە، دەبوایە ڕێژەی خوێندەواری هەموو کوردێک زۆر بەرز بوایە، بە تایبەت خوێندن و نووسین بە کوردی (٣٤). کەوابوو چاکسازی لە زماندا مەسەلەیەکی گرنگ بوو بۆ بیرمەندانی ناسیونالیست کە تێیدا ژنانی کوردیش دەوریان هەبوو. بیرمەندانی کورد وا بۆ مەسەلەکە دەچوون کە پێشکەوتنی زمانی دایک شتێکی زۆر پێویستە بۆ ئەوەی پەروەردەکردنی خەڵک سەر بکەوێت، هەروەها کە بیرمەندێکی کورد لە سەرەتای ساڵی ١٩٠٨دا نووسی: "هەروەها کە هەموو دەزانن، زمان ئامرازی پەروەردەیە. ئامرازی گەیشتن بە زانست و تەکنۆلۆژی، پێشکەوتن و شارستانی، زمانە. گەلێک کە زمانی نووسراوی نەبێت یا کۆمەڵێک بەرهەمی نووسراوی باشی نەبێت، فەوتاوە و توانای ئەوەی نابێت باش قسە بکات و بیرو بۆچوونەکانی دەرببڕێت". (٣٥)

پەیوەندی نێوان زمان و پەروەردە، بە تایبەت پەروەردەی نەتەوەیی لە لایەن زۆربەی نووسەرانی ئەو سەردەمەوە گرنگی پێدراوە و لە بارەی ئەم

---

[88] لە ناو وتارەکەدا وەرگێرانە ئینگلیزییەکەی ئەم شیعرە دانراوە، بەڵام من دەقە ئەسڵییەکەی ئەم شیعرەم لە ڕۆژنامەی "ژین"دا دۆزییەوە و وەک خۆی لێرە دامناوە (تەنها لە ڕووی شێوەی نووسینەوە تۆزێ دەستکاریم کردووە)، چونکە بۆ خوێنەر لەوانەیە گرنگ بێت کە بزانێت شێوەی نووسین بە زمانی کوردی لەو قۆناغەدا چۆن بووە (وەرگێڕ).

تەوەرە وتاریان نووسیوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە لە ساڵانی پێشووتردا، زمان وەک هاوتای پەروەردە سەیر دەکرا، چونکە ڕۆشنبیرانی کورد ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ڕوانگەی ناسیونالیستیان دەگرتە بەر و ڕوانگەکانی خۆیان بە نیسبەت زمان بە گوێرەی ناسیونالیزم دەپاڵاوت. زمان نەک تەنها هۆکاری سەرەکی پەروەردە بوو، بەڵکو بۆ پەروەردەیەکی نەتەوەیی جیاواز و پێشکەوتنی زمانی کوردی پێویست بوو و ئەم پێویستییە نەک تەنها بۆ فێرکردنی کوردەکان بە زمانی خۆیان بە شێوەیەکی ناسیونالیستی بوو، بەڵکو بۆئەوەش بوو کە بۆ خەڵکی جیهان ڕوون بێتەوە کە کوردەکان تایبەتمەندییەکانی دیکەی "نەتەوەبوونیان"، لەوانە ئەدەبیاتی نووسراو و مێژوویەکی نووسراویان هەیە (٣٦). هەروەها کە نووسەرێک ئەو کاتە نوسیبووی: "بە تایبەت لەم سەردەمەدا لە جیهانی شارستانیدا، هۆکاری سەلماندن و بوونی هەر نەتەوەیەک، زمان و نەتەوەکەیەتی. نەتەوەیەک کە ئەم دوو هۆکارەی بۆ سەلماندنی خۆی نەبێت، گرنگی پێنادرێت و کەس گوێی پێنادات (٣٧)".

لە کاتێکدا کە زۆربەی ڕۆشنبیران لەسەر گرنگی زمان بۆ نەتەوەسازی هاوڕا بوون، لە گفتوگۆ و موناقەشە زیندووەکاندا دەربارەی ئەوەی کە پاراستن، چاکسازی و پێشکەوتنی زمانی کوردی دەبێت چۆن بکرێت، بەشدارییان دەکرد. مەسەلەی ستانداردکردنی زمانی کوردی و چاکسازی لە ئەلفوبێکەیدا یەکێ لە گرنگترین مەسەلەکانی پەیوەندیدار بە زمان بوو کە سەرنجی ڕۆشنبیرانی کوردی بەرەو لای خۆی ڕاکێشابوو. ئەم دوو مەسەلەیە زۆر سیاسی کرابوون، چونکە مەسەلە تەنها چارەسەرکردنی کێشەی زمانی کوردی نەبوو، بەڵکو ئەوە بوو کە کام زاراوە دەبێ بکرێت

بە زاراوەی ستاندارد، کەوابوو لە کردەوەدا بڕیاردان لەسەر ئەو مەسەلەیە دەدا کە کام زاراوەی کوردی زۆرترین قسەکەری هەیەو بڵاوە.

ستاندارد کردنی زمان بۆ ناسیونالیستەکان گرنگ بوو، چونکە دەیانویست پرۆژەی دروستکردنی نەتەوەیەک جێبەجێ بکەن، نەتەوەیەک کە بە زمانی نەتەوەیی قسە بکات. بەهەمان شێوە باس و گفتوگۆ و موناقشە لەسەر ئەو مەسەلەیە لە ناو ناسیونالیستەکاندا هەبوو کە دەبێ ئەلفوبێی عەرەبی بۆ نووسینی کوردی بەکاربهێنرێت، یا ئولفوبێی لاتینی؟ سەرچاوەی ئەم باس و موناقەشەیە زۆرتر بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە شارستانی نەتەوەی کورد دەبێ بە کام عاقاردا بڕوات[89] نە ئەوە کە لە ڕاستیدا کامیان زیاتر بۆ زمانی کوردی گونجاوە، هەرچەند کە ناسیونالیستەکان هەوڵیاندەدا لە باس و موناقەشەکانیاندا ئەوە بڵێن کە ئەلفوبێی لاتین بۆ زمانی کوردی گونجاوترە. (٣٨)

لە ئاخێوی ناسیونالیستیدا دەبوایە ژن دەوری لە چاکسازی زماندا بگێڕایە و ئەمەش تەنها بەهۆی چوارچێوەی توانای ژنان وەک لێکۆڵەر و زمانناسی دیکە نەبوو، بەڵکو وەک یەکێ لە سەرچاوە پڕ بایەخە سروشتییەکانی نەتەوە سەیر دەکرا. بیرمەندان و چالاکانی ناسیونالیست وەک سەرچاوەی "کوردییەکی پاراو"سەیری ژنان و کۆمەڵانی خەڵکیان دەکرد. بەهۆی ئەوەی ژنانی گوندیی بە گشتی پەیوەندی زۆر کەمیان لەگەڵ خەڵکی غەیرە کورد زمان هەبوو، ناسیونالیستەکان

وابیریان دەکردەوە ئەو کوردییەی کە ئەم ژنە گوندییانە قسەی پێدەکەن، ڕەسەن و پاراوە و نەکەوتووەتە ژێر کاریگەریی خراپی

---

89- مەبەستی ئەوەیە کە بە عاقاری ڕۆژهەڵاتدا بڕوات یا ڕۆژئاوا؟ ( وەرگێڕ)

زمانەکانی دیکە. لە ئەنجامدا ئەو کەسانەی کە چاکسازییان لە زماندا دەکرد، لە پرۆژەی ستانداردکردنی زمانی کوردیدا وەک گەنجینەیەکی نەتەوەیی سەیری ژنیان دەکرد. خەلیل خەیاڵی[٩٠] کە بیرمەندێکی ناسیونالیست بوو کە بە تایبەت لە بواری چاکسازی لە زماندا چالاک بوو، پێداگری لەسەر ریفۆرمخوازانی زمان دەکرد کە لەپێناو پێشخستنی زمانی کوردی و دروستکردنی زمانێکی ستاندارد، ئەدەبیاتی زارەکی و نووسراوی کورد کۆبکەنەوە. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە خەلیل خەیاڵی دەیگوت: "مێشک و بیری کۆمەڵانی خەڵک، گەنجینەی وشەکانە. قاعیدەیەک هەیە کە ئەمڕۆ بە گشتی قبوڵ کراوە، ئەویش ئەوەیە کە پاراوترین زمانی هەر نەتەوەیەک ئەو زمانەیە کە کۆمەڵانی ئاسایی خەڵک قسەی پێدەکەن، بە تایبەت ژنە بەساڵاچووەکان" (٣٩).

کەوابوو ژنان دەورێکی ئاشکرایان لە نەتەوەسازیدا هەبوو و وەک هێمای کولتووری نەتەوەیی و دایک و فێرکەری منداڵانی نەتەوەی کورد سەیر دەکران. بەهەرحاڵ کوردە ناسیونالیستەکان دەیانگوت بۆ ئەوەی ژنی کورد هەروا کەڵکی بۆ پرۆژەی ناسیونالیستی هەبێت، دەبێ بەردەوام وەک سەرچاوەی ڕەسانەیەتی کوردی خزمەت بکات و منداڵەکانی بە شێوەیەکی ناسیونالیستی پەروەردە بکات و کوردبوونی خۆی بپارێزێت. کوردە ناسیونالیستەکان بە تایبەت لەوە تورە بوون کە ئەو ژنانەی کە لە شارەکاندا دەژین، کوردایەتییان لە بیرچووەتەوە و کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی خراپی کولتووری بیانی. ئەم کێشەیە لانیکەم لەلایەن دوو نووسەرەوە، تەنانەت پێش لە هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی

---

Xelil Hayali-[90]

سەرنجی پێدراوە. یەکێ لەم نووسەرانە کاتێک کە باسی شاری خارپوت دەکات، لە بەتورکبوونی ژنانی کورد گلەیی دەکات و دەنووسێت:

"کاتێک کە مرۆڤ بەرەو گوندەکان دەچێت کۆمەڵێک وێنەی سەرنجڕاکێش دەبینێت، بە تایبەت وێنەی ئەو ژنە ماندووانەی کە بەدوای گوێدرێژدان کە باری داریان پێیە. کۆمەڵێک تایبەتمەندی هەیە کە ژنانی شار (کە بوونە بە تورک) لەم ژنە گوندنشینانە جیا دەکاتەوە و بە دەگمەن لە ناو ژنانی شارنشیندا بەدیدەکرێت وەک جیددیبوون، بەهێزبوون، چالاکبوون و ئازادبوون و لەوە زیاتر تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکان. من سەرم لەوە سوڕماوە کە هۆکاری نەخۆشبوون و لاوازبوونی ئەم ژنە شارنشینانە چییە کە لە گوندەوە هاتوون، بەڵام تایبەتمەندییە ڕەگەزیی و ڕاستەقینەکانی خۆیان لەدەستداوە. من هۆکاری ئەم مەسەلەیە بۆ ئەوە دەگەڕێنمەوە ئەم ژنانە کە (دەستیان لە نەتەوەکەیان هەڵگرتووەو بە بچووکی دەزانن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕەوتی مۆدێرنبوونیان گرتووەتە بەر) ئەوەیە کە بە هەڵە لە مەسەلەکە تێگەیشتوون". (٤٠)

کەوابوو لە ڕوانگەی ناسیونالیستەکانەوە، چارەسەرکردنی "کێشەی ژن" و چاکسازی لە کاروباری ژنان لە کۆمەڵگەی کورددا شتێکی پێویستە و ڕێگا بۆ ئەوە خۆشدەکات کە ژنی کورد ببێت بە ژنێکی مۆدێرن، بەڵام بە مەرجێک کەپێداگر بێت لەسەر کوردایەتی و تایبەتمەندییە نەتەوەییەکان. ئەرگەنی مادەنلی[٩١] لە وتارێکدا لەژێر ناوی"کێشەی ژن لە ناو کورددا" دەنووسێت: "چاککردنەوەی ئەو ژنە شاریانەی کە بیری کوردایەتی و

---

[91] Ergeni Medenli-

هەڵسوکەوتی کوردیان لە دەستداوە، دەلوێت (دەستدەدات)، بەڵام ئەم ئامانجە تەنها بە هەوڵی زیاتر و کاری زیاتر بەدیدێت" (٤١).

## جیاواز و مۆدێرن

بەهەرحاڵ کوردە ناسیونالیستەکان لە لایەکەوە بۆ ڕاگرتنی پاراوبوونی زمانی ژنان و لە لایەکی دیکەو بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ژنی کورد و کۆمەڵگەی کورد و نەتەوەی کورد بەگشتی خاوەن تایبەتمەندییەکانی سەردەمە، لەگەڵ کێشەیەک ڕووبەڕوو بوون. ناسیونالیستەکان ئەم کێشەیان (هەروەها کە لە سەرەوە باسمانکرد) بەو هەڵێنجاندنە چارەسەر دەکرد کە پێگەی ژن لە ناو کۆمەڵگەی کورد تا ئێستا لەگەڵ پێداویستییەکانی مۆدێرنیتە گونجاوە و تەنها شتێک کە ژنی کورد نەیبووە، پەروەردەیەکی مۆدێرن بووە. نووسەرە ناسیونالیستەکان لە وتارەکانیاندا لە کاتی بەراوردکردنی بارودۆخی ژنانی کورد لەگەڵ بارودۆخی ژنانی موسڵمانی عوسمانی، دەیانگوت کە ژنی کورد لە ناو کۆمەڵگەدا بالادەست بووە و لە ڕاستیدا ئازادی زیاتری بووە. هەروەها ئەم بەڵگە و هێمایە بەشێکی گرنگی پرۆژەی ناسیونالیستەکان بوو بۆ ئەوەی ئەوە بسەلمێنن کە نەتەوەی کورد وەک نەتەوەیەکی جیاواز بوونی هەیە و خاوەن ئەو تایبەتمەندی و شەرتومەرجانەیە کە پێویستە بۆ ئەوەی بچێتە ڕیزی دەوڵەت – نەتەوەکانی جیهان.

ناسیونالیستەکان هەروەها کە لە مێژوو، ئەدەبیات و زمان کەڵکیان وەردەگرت بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی جیاوازە، لە تایبەتمەندییە بێ وێنەکانی ژنانی کورد بە بەراورد لەگەڵ ژنانی دیکەی

موسڵمان و عوسمانی بۆ دروستکردنی مەسەلەی نەتەوەیی خۆیان کەڵکیان وەردەگرت. ئەمە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەو مەسەلەیە بوو کە بۆ ناسیونالیستەکان ئەوەندە پێداگرییان لە سەر ئارەزوی خۆیان بۆ ڕاگرتنی کوردایەتی لە ناو ژنی کورددا دەکردەوە و هەوڵیاندەدا ئەو ژنە کوردانەی کە تایبەتمەندییە ڕاستەقینەکانی خۆیان لە دەستدابوو و لە نەتەوەی خۆیان بڕابوون، دیسان بکەنەوە بە کورد. ئەگەر هەرچەشنە شک و گومانێک بە نیسبەت تایبەتمەندی نەتەوەیی هۆکارەکانی ڕەسەنایەتی نەتەوەیی هاتبایە ئاراوە، ئەو کاتە خاڵەکانی جیاکەرەوەی نەتەوەی کورد بە گشتی دەچووە ژێر پرسیار. هەوڵەکانی ناسیونالیستەکان بۆ پاراستن و نیشاندانی"پاراوبوون" و جیاوازبوونی نەتەوەی کورد بە گشتی بە ژن سنووردار نەبوو و هەرچەند کە بارودۆخی ژنان گرنگی تایبەتی بۆ ناسیونالیستەکان لە ئاخێوەکەیاندا هەبوو، بەڵام تەنها لە چوارچێوەی بزوتنەوەیەکی گەورەتر بۆ پێداگرتن لەسەر مەسەلەی نەتەوەیی کورد وەک نەتەوەیەکی واقیع و جیاواز، سەیری ژنیان دەکرد(٤٢). لە ڕاستیدا سەرهەڵدانی کێشەی ژن و ڕاکێشانی ژنان بۆ ناو باس و گفتوگۆکانی کوردەکان دەربارەی سیاسەت و کۆمەڵگە، بەشێک بوو لە هەوڵەکانیان بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو کەسانە بدەنەوە کە حاشایان لەوە دەکرد کە کورد نەتەوەیەکی جیاوازە.

عەبدوڵڵا جەودەت کە کوردێکی ناسیونالیست بوو، تەنها کەسایەتییەکی کوردی عوسمانی نەبوو کە شانازی بەوە دەکرد کە لە قۆناغێکدا دەژی کە تێیدا بڕیار لەسەر چارەنووسی نەتەوەکان دەدرێت و بە فەرمی دەناسرێن. بە واتایەکی دیکە نوخبە کوردەکان تەنها گروپی

عوسمانی نەبوون کە دانیان بە هێزی ڕوو لە گەشەی ناسیونالیزم لە جیهانی مۆدێرندا دەنا و بە گوێرەی ئەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد. ناسیونالیزمی تورک کە لە کۆتایی سەدەی ١٩ سەریهەڵدا و بوو بە هێزێکی باڵادەستی ڕوو لە گەشە لە ئاخێوی سیاسی و کولتووری عوسمانی لە سەرەتای سەدەی ٢٠دا، لەپاڵ عاقارێکی هاوشێوەدا لە لایەن بیرمەندەکانییەوە پێشکەوت، بیرمەندگەلێک کە خاڵی هاوبەشی زۆریان لەگەڵ بزوتنەوە ناسیونالیستەکانی کورد و گەلانی دیکەی عوسمانیدا هەبوو.

بەهەرحاڵ ئەوە کە بووە هۆی سەرکەوتنی ناسیونالیزمی تورک و دەوڵەتی عوسمانی، بەرکەنار لە پشتیوانی نەکردنی کەسانی غەیرە تورک و بەتایبەت ئەوانەی کە خوازیاری جیابوونەوە لە عوسمانی بوون، ئەو ڕاستییە بوو کە ناسیونالیستە تورکەکان لانیکەم بە ڕواڵەت زیاتر لە کەسانی دیکە هۆگری ئەوە بوون کە کیانی دەوڵەتی عوسمانی بە یەکپارچەییەوە ڕابگرن، کەوابوو پێویستیان بەوە بوو کە پێش لەو سیاسەتە جیاییخوازانە بگرن کە بزوتنەوە جیاییخوازەکان بەڕێوەیان دەبرد (٤٣). عوسمانیزم یا پەیڕەوکردنی ناسیونالیزمێکی ڕەسمی یەکەم وەلام بەم سیاسەتە بوو(٤٤)، بەلام چونکە ناسیونالیزمی تورک لە ناو ئەو کەسانەدا کە دەسەلاتیان لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا بەدەستەوە بوو، بلاوتر بووەوە، ئاخێوی ڕەسمی لە پێناو شوناس و یەکگرتوویی عوسمانی بە قازانجی ناسیونالیستە تورکەکان بەهێزتر بوو. ئەم بەهێزبوونە بۆ نموونە لە سیاسەتەکانی دەوڵەت بە نیسبەت کۆڕوکۆمەڵە ئەتنیکییەکان و زمانی فەرمی پاش قەیرانی باڵکان لە ١٩٠٨ و بەهێزتربوونی ئەم

سیاسەتە لە ١٩١٣ بە لەدەستچوونی هەتاهەتایی باڵکان لە دەستی عوسمانی ڕەنگی دایەوە. ئەم سیاسەتە لە قۆناغی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی توندتربوو، چونکە ئەو کاتە ئەو خاکە کە لە دەستی عوسمانیدا (سەردەمێک ئیمپراتۆرییەکی گەورە بوو) مابوو، ئێستاش داگیرکرابوو و لە سەروبەندی ئەوەدا بوو کە لە لایەن هێزەکانی دیکەوە دابەش بکرێت.

بیرمەندانی کورد وەک ڕۆشنبیرانی گروپەکانی دیکەی عوسمانی (٤٥)، گلەییان لەم سیاسەتانە دەکرد و وای بۆ دەچوون کە ئامانجی ئەم سیاسەتانە بە تورککردنی کوردەکان و مێژووەکەیان و حاشاکردن لە بوونی کوردە. هەروەها کە پێشتر نیشانماندا، نارەزایەتی و توورەیی لە سیاسەتی "بە تورککردن" لە سەرەتای ساڵی ١٩١٣ سەریهەڵدا، بەڵام پاش شەڕی یەکەمی جیهانی توندتر بووەوە (٤٦). ڕۆشنبیرانی کورد سەرەتا بە شەرمەزارکردنی چالاکییەکانی ئەو کەسانەی کە بۆ نموونە بوونی کوردیان ڕەت دەکردەوە (لە ڕێگای ئەوە کەلە باتی وشەی" کوردستان" کۆمەڵێک ناوی دیکەیان وەک "پارێزگاکانی ڕۆژهەڵات"، "ناوچەکانی ڕۆژهەڵات" و تەنانەت "ناوچە ئەرمەنی نشینەکان" بەکار دەهێنا) وەڵامی ئەم سیاسەتانەیان دایەوە (٤٧).

بەهەرحاڵ ناسیونالیستە کوردەکان تەنها بە شەرمەزارکردنی سیاسەتەکانی "بە تورککردن" ڕانەوەستان و بە کۆمەڵێک شێوە کاریانکرد بۆ ئەوەی نیشانیبدەن کە کوردەکان نەتەوەیەکی جیاوازن و لە ڕاستیدا تورک نین (٤٨).

خستنەڕووی خاڵە جیاوازەکانی ژنانی کورد لەگەڵ ژنانی گروپەکانی دیکەی موسڵمانی عوسمانی وەک تورک و عەرەبەکان، یەکێک لە بەشە

گرنگەکانی هەوڵەکانی ناسیونالیستە کوردەکان بوو بۆ شەرمەزار کردن و ڕەتکردنەوەی ئەو هەڵێچاندن و سیاسەتانەی کە (بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە کورد نەتەوەیەکی جیاواز نییە) و سەلماندنی ئەوە بە جیهان کە کوردەکان شایانی ئەوەن کە وەک نەتەوەیەکی جیاواز بە فەرمی بناسرێن و هەڵسوکەوتیان لە گەڵدا بکرێت. هەروەها ئەمە دەرفەتێک بوو بۆ هەندێک لە ناسیونالیستەکان تا کەسایەتییە ئیسلامیخوازەکان یا ئەوانەی کە لە ئاخێوی یەکگرتوویی ئایینی بۆ پووچەڵکردنەوەی بانگەشە ناسیونالیستییەکان کەڵکیان وەردەگرت، پەراوێز بخەن. مەمدووح سەلیم بەگ وەها باسی ئەم گروپانە دەکات: "ئەمە ڕاستییەکی ئاشکرایە ئەو پێگە و مافانەی کە ژنان لە سەرەتای سەردەمی ئیسلامدا هەیانبووە، زۆر لەو مافانە زیاتر بووە کە ئیستا هەیانە، بەڵام تەنانەت ئێستاش کۆمەڵێک کەس هەن کە وابیر دەکەنەوە کە تەنانەت ئەم تۆزە مافەش بۆ ژنان زیادە و مافەکانیان زۆر لەوە کەمترە کە ئەوان داوای دەکەن. ئەرکی عولەما و لێکۆڵەرە ئایینییەکان ئەوە نییە کە ئەرکە ئایینییەکان بپارێزن، بەڵکو ئەوەیە کە ئەم مافانە لەگەڵ پێداویستییەکانی سەردەم بگونجێنن و نەبنە لەمپەرێک لە سەر ڕێگای نوێکردنەوە و بەکارهێنانی ئەم مافانە. بە بۆچوونی من بۆ ئەوەی لەو هەڵەیە تێبگەین کە لە ئیسلامدا مافی ژنان چەندە لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئەم ئایینە ناتەبایە و ئەم چەمکەش چەندە ئەمڕۆ بە هەڵە وەرگیراوە، ئەوەندە بەسە کە پێگەی ژن لە ناو نەتەوە جۆراوجۆرە موسڵمانەکان و چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی ئەم نەتەوانە تاوتوێ بکەین". (٤٩)

مەمدوح سەلیم بەگ بە چڕبوونەوە لەسەر ئەو مەسەلەیە کە تاڕادەیەکی زۆر خراوەتەوە پەراوێزەوە، لە شوێنێکی دیکەدا دەنووسێت:

" ئەگەر تا ئێستا هەوڵی زیاتر درابایا بۆ ئەوەی پەروەردەیەکی باش بە ژنان بدرێت و لە باتی ئەوەی پێیان بگوترایە چۆن جلوبەرگ بپۆشن، پەروەردە بکرانایە، ئێستا کێشەمان نەبوو و ئامانجمان زۆر زووتر لە ئێستا هاتبووە دی (٥٠)."

مەمدوح سەلیم بەگ هەروەها لە کێشەی ژن کەڵکی وەردەگرت بۆ ئەوەی خاڵە جیاوازەکانی کوردەکان لەگەڵ موسڵمانانی دیکەی عوسمانی بخاتەڕوو و دەیگوت: "کوردەکان هاوکات لەگەڵ ئەوەی بێگومان موسڵمانن، بەڵام ئیسلامیان بە گوێرەی پێداویستییەکانی خۆیان نەتەوەیی کردووە" (٥١).

مەمدوح سەلیم بەگ هەروەها دەیگوت کە کوردەکان نەتەنها بە شێوەی خۆیان ئیسلامیان وەرگرتووە، بەڵکو لەم ڕەوتەدا لە دراوسێکانی خۆیان بەهێزتر دەرکەوتوون. مەمدوح سەلیم بەگ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە، لە بارودۆخی ژن لە ناو کۆمەڵگەی کورددا کەڵکی وەردەگرت و بۆ نموونە دەیگوت: "ژنی کورد لە بنەڕەتدا ئازادە و سەرۆکی بنەماڵەیە. ژنی کورد بەرکەنار لە نەریتی شەرم و حەیای ئیسلامی، لە کۆتوبەندە ناپێویستەکان ئازادە و هەروەک پیاو لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشداری دەکات و خاوەن پێگەیەکی بەرزە" (٥٢).

مەمدوح سەلیم بەگ هەروەها بۆ شیکردنەوەی زیاتری ئازادی ڕێژەیی ژنی کورد، ئاماژەی بە کەمبوونی ڕێژەی فرەژنی و تەڵاق لە کوردستاندا دەکرد (٥٣) و دەیگوت کە ژنی کورد لە بنەڕەتدا ئازادە، چونکە هەمان

ئەو ئەرک و کارانە ئەنجامدەدات کە شووەکەی (پیاو) ئەنجامیدەدات، دروست بەهەمان شێوە کە پیاوەکەی دەیکات" (٥٤). مەمدوح سەلیم لەم پەیوەندییەدا ئاماژەی بە بەسەرهاتێکی ڕاستەقینەی سەرنجڕاکێش دەکرد و دەیگوت:

"ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێبوارێک کە کورد نابێت لە وەرزی هاویندا ڕێیدەکەوێتە ماڵێک کە پیاوەکەی لە ماڵ نابێت. ژنی ماڵەکە کە کوردێکی جوان دەبێت میوانەکەی دەباتە ژێر سێبەری دارێک و بە گوێرەی دابونەریت نان و چای دەداتێ. میوانەکە لە کاتی خواردنی ناندا دەکەوێتە بیری ئەوەی تەماح بکاتە ناموسی ژنی ماڵەکە و ئەمەکنەناسی بکات، بەڵام ژنەکە خۆی ناخاتەوە شکەوە. پاش خواردنی نان پیاوەکە کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دەدات و..... ژنی ماڵ خێرا ئەو پیاوە ئەمەکنەناسە دەبەستێتەوە بە دارێکەوە و تا ئێوارە هەروا دەیهێڵێتەوە. کاتێک کە ئێوارە پیاوی ماڵەکە دێتەوە بە سەرسوڕمانەوە لە ژنەکە پرسیار دەکات: "ئەمە کێیە؟ کێ بەستویێتییەوە؟ ژنەکە وەڵام دەداتەوە ئەم پیاوە دەیویست شتێکی تۆ بدزێت، دەیویست ناموسی تۆ بدزێت و منیش بەستمەوە. ژنەکە دەڵێت سزای ئەم پیاوە ئەوەندە بەسە کە لەسەر لەبەیانییەوە تا ئێستا بەستراوەتەوە و پاشان بەریدەدات" (٥٥).

مەمدوح سەلیم بەگ لە کۆتایی ئەم بەسەرهاتەدا دەڵێت: "ئەمە نموونەیەکی زەقی بەرزبوونی کەسایەتی ژنی کوردە و نموونەی بەسەرهاتی وا لە ناو کۆمەڵگەی کورددا ئەوەند زیادە کە بووە بە شتێکی باو. ئەمە جۆرێک دڵنیایی کۆمەڵایەتییە و نیشانەی شارستانییە و دەکرێت وەک تایبەتمەندییەکی پڕ بایەخی نەتەوەی کورد سەیر بکرێت" (٥٦).

کوردە ناسیونالیستەکان ئەم ئازادییەی ژنی کورد بە بەراورد لەگەڵ ژنانی نەتەوەکانی دراوسێیان بۆ ئەوە دەخستەڕوو کە نیشانییدەن کە یەکەم: کوردەکان لە دراوسێکانیان جیاوازن و دووەم : کوردەکان بە گوێرەی تایبەتمەندییەکانی سەردەم هەڵسوکەوت دەکەن و ڕێز لە "ئازادی ژن" دەگرن کە بووە بە وشەی سەر زاری ئاخێوی مۆدێرنیستەکان. تەنانەت پێش لە شەڕی یەکەمی جیهانیش، ئەرگەنی مادەنلی خاڵەکانی ئەم هەڵهێنجانەی سەرەوەی پێکەوە تێکەڵ کرد و ئەو بانگەشەیەشی بە سەریدا زیاد کرد کە: "بەهۆی ئەوەی ئەم خاڵە ئەرێنیانە هەمیشە لە ناو کورددا بووە ( چ لە ناو بنەماڵە و چ لە ژیانی گشتیدا)، بیروبۆچوونی خراپ بە نیسبەت ژن و بنەماڵە لە ڕەوتێکی خێراتر و ئاسانتردا لەناو دەچێت و هەروەک مەسەلەی ئەلفوبێی زمانی کوردی، کوردەکان دەتوانن ڕێگاچارەیەکی تایبەتی ئاسان بۆ چارەسەرکردنی "کێشەی ژن"یش بدۆزنەوە" (٥٧).

مادەنلی لە درێژەدا نووسی: "جگە لە شارەکان (کە تایبەتمەندی ڕاستەقینەی خۆیان لە دەستداوە)، بە گشتی لەناو گوندەکاندا پێگەی ژن سەرەڕای ئەوەی کە سەرەتاییە، بەڵام بێ وێنەیە". مادەنلی ئاماژە بەوە دەکات کە ژنان بەهۆی ئەو دەورە کە وەک ناوبژیوان لە نێوان گرووپە ڕکابەرەکاندا دەیگێڕن، ڕێزیان لێ دەگیرێت. ئەرگەنی مادەنلی هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە : "لە ناو شار و گوندە کوردەکاندا، حیجابی ژنان توندوتۆڵ نییە و لەو حیجابەی کە ئایین و مەنتیق قبوڵی دەکات، تێناپەڕێت و ژنانی کورد قەد خۆیان ناخزێننە ناو حیجابێکی توندوتۆڵ و بە ئازادی تەواو هاتوچۆ دەکەن و بە دەوروبەردا دەسووڕێنەوە."

ئەرگەنی لە کۆتاییدا دەڵێت: "لە ڕاستیدا بەهۆی ئەوەی کە ژنی کورد نەخوێندەوار و سادەیە (بەڵام خاوەن تایبەتمەندی ئەخلاقی بەرزە) پێویستی بە پەروەردە و زانستێکی سەردەمیانە هەیە و ئەگەر ئەم پەروەردەیە بە ژنی کورد بدرێت و بە واتایەکی دیکە ئەگەر بە ئاستێک لە پەروەردە و زانست بگات کە شیاوی کەسایەتی ژنی کوردە، ئەو کاتە چارەسەرکردنی کێشەی ژن زۆر ئاسانتر دەبێت" (٥٨).

## قۆناغێکی مێژوویی

تا ئێستا ئەوەمان نیشاندا کە چۆن ڕۆشنبیرانی کوردی عوسمانی لە سەرەتای سەدەی ٢٠دا "کێشەی ژن"یان هێنایە ناو چاپەمەنییەکانەوە بە شێوەیەک کە نەک تەنها بە قازانجی خودی ژنان بێت، بەڵکو کەڵکی لێ وەربگیرێت بۆ ئەوەی ببێت بە نموونەیەک بۆ ئەو کێشە گەورەترانەی کە لەگەڵیدا ڕووبەڕوون وەک مەسەلەی مۆدێرنیتە، ئایین و بە تایبەت مەسەلەی ناسیونالیزم. لەهەمان کاتدا بەهەرحاڵ ناسیونالیستەکان پێویستیان بەوە بوو کە باسی تایبەتمەندییەکانی ئەو دەورە بکەن کە بە وتەی خۆیان دەبوایە ژنان لە کۆمەڵگەدا بیانگێڕایە.

ئاماژە کردن بەوە گرنگە کە ڕوانگەکانی نووسەرانی کوردی عوسمانی دەربارەی کۆمەڵگە بە گشتی و "کێشەی ژن" بە تایبەتی، لەگەڵ ڕەوتە ڕۆشنبیرییەکانی زاڵی ئەو سەردەمەدا تەبا بوو. سەرەکیترین نموونەکانی ئەم ڕەوتە، گرنگیدان بە زانست و یاساکانی ڕاستییە بیۆلۆژیکییەکانی مرۆڤ و یاسای سروشتی بوون (٥٩). ڕۆشنبیرانی کورد هەروەک

ڕۆشنبیرانی دیکەی شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان، دوایین کەشفیاتە (دۆزینەوە) زانستییەکانیان دەخستە ناو چوارچێوەی سیاسەتی کۆمەڵایەتی کە بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤەکاندا زاڵ بوو. لە ئەورووپا و ئەمریکای باکوور، بیرۆکە زانستییەکان دەربارەی ڕەگەز، جنس و چین کە بۆ پاساوهێنانەوە بۆ هەڵاواردنە کۆمەڵایەتییەکان و دروستکردنی کۆمەڵێک هەڵاواردنی نوێی دیکە بەکار دەبرا. لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵگەیانەی کە لەگەڵ مەترسییەکانی دەوڵەتە کۆلۆنیالیست (موستەعمەرەچی) و ئیمپیریالیستەکان ڕووبەڕوو بوون، سەریانهەڵدا و بووە هۆی گۆڕینی بارودۆخی ئابووری و دروستبوونی شەپۆلی کۆچ و کۆچبەران. ئەم ئاڵوگۆڕانە یارمەتی دا بە سەرهەڵدانی بیروڕای سیاسی نوێ کە کاریگەری لەسەر جۆری پرسیارەکان و پرۆژەکانی زانستوانان هەبوو. بە واتایەکی دیکە "سروشت" کە دەوری سەرەکی لە سەرهەڵدانی بیرۆکەی لیبڕالیزمدا گێڕا، وەک سیاسەتی باڵا (لە پاڵ یاساکانی سروشتدا) سەیر دەکرا (شەیبینگێر،١٩٨٧:٤٣). لەگەڵ ئەمەشدا گەلێ لە زانستڤانان و بیرمەندانی کۆمەڵایەتی لە ڕاستیدا خودی "سروشت"یان بە هەمدەستی تاوانی نایەکسانی دادەنا. (٦٠)

گەلێ لە ڕۆشنبیرانی کورد بەشێک بوون لە گرووپێکی ڕۆشنبیری بەرفراوانتر کە گرنگی بە زانست دەدا و بە کردەوە ستایشی یاسای "سروشت"ی دەکرد. ئەم ڕۆشنبیرانە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە خودی ناسیونالیزم وەک خاڵێکی حەتمی لە ڕەوتی مێژوو و یاسا کۆمەڵایەتییەکاندا سەریهەڵداوە (٦١) و "خەباتی نەتەوەییان"بە لایەنێکی کۆمەڵایەتی لە ناو ململانێ بۆ مانەوە لە قەڵەم دەدا (٦٢). کەوابوو،

ڕۆشنبیرانی کوردو (ڕۆشنبیرانی دیکەی غەیرە ئەوروپایی و ڕەشپێست و سورپێستەکانی باکووری ئەمریکا) توانییان لە ڕێگای گونجاندنی کۆمەڵگەی خۆیان لەگەڵ هەمان ئەو ڕێوشوێنە جیهانییەی "یاسای سروشت"، ئاخێوی ڕۆژئاوایی باڵادەستی نەژادی ئاوەژۆ بکەنەوە چونکە ئەمەیان وا لێکدەدایەوە کە هەموو کەسێک توانای ئەوەی هەیە ببێت بە شارستانی (٦٣)، کەوابوو جۆرێک لە جۆرەکانی نایەکسانییان پێچایەوە. لەهەمان کاتدا ئەم ڕۆشنبیرانە لە ئاخێوی زانستی زاڵی سەردەم کەڵکیان وەردەگرت بۆ ئەوەی کۆمەڵێک جۆری نوێی نایەکسانی لەناو کۆمەڵگەی خۆیاندا (لێرە مەبەستمان زاڵبوونە بەسەر پێگەی ژن لە ناو نەزمی (ئاژینی) نەتەوەیی نوێی مۆدێرندا) دروست بکەن.

کوردەکان هەرچەند کە لەوانەیە بە بەراورد لەگەڵ هاوتا ڕۆژئاواییەکانی خۆیان، زۆربەی توێژینەوە زانستییە ڕاستەقینەکانیان پشتگوێ خستبوو، بەڵام لە پرۆژەکانیاندا لە ڕۆحی ئەم کەشفیاتە زانستیانە کەڵکیان وەردەگرت. کەوابوو ئەو دەورە کە ئەوان دەیانگوت دەبێت ژن لە نەزمی نوێدا بیگێڕێت لەسەر بنەمای ئەو بیروبۆچوونە نەبوو کە ژن و پیاو خاوەن بەهرەی یەکسانن بۆ ئەوەی دەوری یەکسان بگێڕن. لە ناو ڕەوتە زانستییەکانی ڕۆژئاوا لەشی مرۆڤ بە تایبەت کاسەی سەر (چونکە پەیوەندی بە بەهرەی مرۆڤەوە هەیە و بە گوێرەی کەشفیاتەکانی زانستڤانانی ئەمریکای باکوور و ئەوروپا، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە بەهرەی مرۆڤەوە هەیە) شیکراوەتەوە و تاقیکراوەتەوە بۆ ئەوەی پاساوێکی زانستی بۆ ژێردەستکردنی ڕەشپێستان، ژنان، کۆچبەران و دانیشتوانی ڕەسەنی سەراسەری جیهان بدۆزنەوە. بەڵام ئەنجامی ئەم

تاقیکردنەوانە دەریخست کە زەرفییەتی (گەورەیی و بچووکی) کاسەی سەری ئەم گروپانە هەروەک زەرفییەتی سپییپێستەکانە و ئەڵبەتە هەندێجاریش لەوان زیاترە (٦٤). فیزیۆلۆژی ژنانیش (کە کاسەی سەریان بچووکە و لەگەنیان گەورەیە) بەدەر لە چوارچێوەی ڕۆشنبیری ژنان و لە چوارچێوەی توانای زاوزێی ژناندا سەرنجی پێدراوە.

کەوابوو ئەو دەورەی کە ژنان لە نەزمی نوێی کۆمەڵایەتیدا دەبوایە بیانگێڕایە، دەورێکی ڕۆشنبیری نەبوو بەڵکو دەوری زاوزێکردن، دایکایەتی و گواستنەوەی کولتوور بوو(٦٥). ژن دەبوایە لە ناو ئەو چالاکییانەدا خۆی تێوەگلاندبایە کە لەگەڵ کەسایەتی ژندا گونجاو بوو و بە قازانجی ئامانجە ناسیونالیستییەکان بوو. کەوابوو کوردە ناسیونالیست و مۆدێرنیستەکان بە کەم لە قەڵەمدانی بەهرەی ژنان، وەک ئامرازێکی پلە نزم کەڵکیان لە ژنان وەردەگرت، کەوابوو وەک ناسیونالیست و مۆدێرنیستەکانی شوێنەکانی دیکەی جیهان، پارادایمێکیان بۆ ژنان دروست کردو کەڵکیان لێ وەرگرت کە هەوڵیدەدا هەڵاواردن و نایەکسانییە جنسییەکان بە شێوەیەکی نوێ لەژێر ناوی پێشکەوتن و نەتەوەسازیدا بکات بە یاسا و ڕێوشوێن.

## ئەنجام

ڕوونە کە ڕۆشنبیرانی کورد بیرۆکە ڕۆژئاواییەکانیان نەک تەنها خستووەتە ناو باس و گفتوگۆکانیان لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی کۆمەڵگەکەیاندا، بەڵکو ئەم بیرۆکەیەشیان خستووەتە ناو ڕوانگەی خۆیان و (بە وتەی هانی ئوغلوو[92] خستوویانەتە ناو والتانشۆگی[93] خۆیان). لەهەمان کاتدا دەبێ سەرنج بەوە بدەین کە ڕۆشنبیرانی کورد تەنها بیرمەندی لاساییکەرەوە نەبوون کە چاو و گوێبەستراوانە چەمک و بیرۆکە ئەوروپییەکان وەربگرن، بەڵام بەهەرحاڵ لەهەمان کاتیشدا ئاخێوەکەیان چڕوپڕ و سیستماتیک نەبوو، چونکە دەبێ لەبیرمان بێت کە ئەم بیرمەند و هەڵسوڕاوانە هەڵێنجاندنەکانی پەیوەندیدار بە "نەریت" و "مۆدێرنیتە"یان پشتگوێ دەخست(٦٦)، چونکە ئەم دوو چەمکەیان لە سافی (بێژن) ئیدوئولوژیکی خۆیاندا دەپاڵاوت و هەوڵیاندەدا لەم ڕێگایەوە ببن بە خاوەن چارەنووسی خۆیان لەو کاتەو لە داهاتوودا.

کەوابوو"کێشەی ژن" لەم چوارچێوەیەدا سەریهەڵدا، چونکە نوخبە کوردە ئاوارەکان و ئەندامانی چینە نوێیە خاوەن پیشەکان کاریان بۆ ئەوە دەکرد کە لە سەروبەندی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتدا پلەوپایەی نوێ بۆ خۆیان دابتاشن. ئەو کاتە هەرچەند کە هەموو کەسێک ڕێگای ناسیونالیستی نەدەگرتەبەر، بەڵام زۆربەی هەڵسوڕاوان ئەم ڕێگایەیان گرتەبەر، چونکە

---

Hanioglu-[92]

weltanschauung -[93]

ئەم ڕێگایە لە جیهانی نەتەوەییدا ڕۆژبەڕۆژ ڕەوایەتی زیاتری پەیدا کرد (٦٧). بۆ تێگەیشتن لەم خاڵە دەبێ سەرەتا لەوە تێبگەین کە بیرمەندانی کوردی عوسمانی بەرهەمی سەردەمی مێژوویی خۆیان بوون و بیروباوەڕ و ڕەفتارەکانیان نە نامۆ بوو و نە تایبەت بوو. "کێشەی ژن" هۆکارێکی گرنگ بوو لەناو ئاخێوێکی ناسیونالیستی- مۆدێرنیستی بەرفراوانتردا و بیرمەندانی جۆراوجۆر بە شێوەگەلی جۆراوجۆر کەڵکیان لێ وەردەگرت بۆ ئەوەی هەوڵەکانیان بەهێزتر بکەن لە پێناو ئەو ئامانجەدا کە ناسیونالیزم و مۆدێرنیتەیەک بۆ خۆیان بەرهەمبهێنن و جینسی بکەن.

سەرچاوە:

**Janet KLEIN, in: Shahrzad Mojab (ed), Women of a non-state nation: the Kurds. Costa Mesa, California: Mazda Publishers, 2001.**

## پەراوێزەکان:

١- بۆ نموونە بڕوانن بۆ وتاری"کاریلەریمیزە" (بۆ خوێنەرەکانمان)، بڵاڤۆکی "ژین"، ژمارە ١٨،٢١ی حوزەیرانی ١٣٣٥-١٨ی ژوەنی ١٩١٩، لاپەڕەی ١٧.

٢- ئەرگەنی مادەنلی:"کورد لەردە کادیم مەسەلەسی" (کێشەی ژن لە ناو کوردەکاندا)، بڵاڤۆکی "ڕۆژی کورد"،٣٠ی ئابی ١٣٢٩-١٢ی ئەیلولی ١٩١٣، لاپەڕەی ١٠-١١.

٣- بەهۆی نەبوونی جێگا، لە باتی دانانی بەشێکی جیاواز و بەراوردکردنی شێوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنان لە ئاخێوی ناسیونالیستی کورددا لەگەڵ نموونە هاوچەرخەکانی، لە پەراوێزەکاندا هەندێ زانیاری بەراوردکاری لەم وتارەدا دەخەمەڕوو. بە زەقکردنەوەی مێژینەی ناسیونالیزمی کورد و لێکچوونە جۆراوجۆرەکانی لەگەڵ بزوتنەوە ناسیونالیستییەکانی دیکەی هاوچەرخ لە سەراسەری جیهاندا، هیوادارم کە ئەو وتەیەی "ابوالحاج"م هێنابێتەدی کە دەڵێت:"ئەگەر مێژوو زانست بێت، دەکرێت مێژووی عوسمانی و (مێژووەکانی دیکە) لەسەر بنەمای پێوانێکی گونجاو کە بۆ لێکدانەوەی مێژووی ناوچەکانی دیکە بەکار براوە، هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێت و ئەو ڕەوتانە تێکبدرێت کە بە گوێرەی ئەوانە مێژوونووسی ئیمپراتۆری عوسمانی و (کۆمەڵگە غەیرە ڕۆژئاواییەکانی دیکە) لێکدەدرێتەوە و دەبێ لەسەر بنەمای تایبەتمەندییەکان و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانی ئەم کۆمەڵگەیانە و ئەم مێژووانە هەڵسوکەوتی لە گەڵدا بکرێت ( ابو الحاج:١:١٩٩١).

٤- دەربارەی ئەم بابەتە بۆ نموونە بنواڕن بۆ "بەدران" (٢٢٧:١٩٩١)، بارۆن (١٩٩٣) و گرۆت (١٩٩٣)

٥- کەوابوو ئەم ڕوانگەیە بەشێوەی "ژنانە" نزیکی مەسەلەکە دەبێتەوە کە سکات (١٩٩٨:٢٠-١) ڕەخنەی لێگرتووە. بە وتەی سکات، لە کاتێکدا کە نزیکایەتی "ژنانە" ڕەوایەتی بە لێکۆڵینەوە لەسەر ژن و گرنگی جنس لە کۆمەڵگە دەدات، بەڵام مەترسییەکانی ئەم شێوە نزیکایەتییە ئەوەیە کە هەندێجار دوو مەسەلەی جیاواز پێکەوە تیکەڵ دەکات، بە واتایەکی دیکە هەڵسەنگاندنی ئەزموونی ژنان و بە ئەرێنی هەڵسەنگاندنی هەموو ئەو شتانەی کە ژنان وتوویانە یا کردوویانە و دەیەوێت ژنان وەک بابەتی تایبەت و جیاواز لە مێژوودا لە شتەکانی دیکە جیا بکاتەوە.

٦- ئەو بڵاوکراوانە کە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە کەڵکیان لێ وەرگیراوە بریتین لە: کوردستان (١٨٩٨-١٩٠٢)، کورد تەعاون و تەرەقی گازیتەسی (١٩٠٨-١٩٠٩)، ڕۆژی کورد (١٩١٣)، هەتاوی کورد (١٩١٣-١٩١٤)، ژین (١٩١٨-١٩١٩) و "کوردستان" (١٩١٩). بۆ سەرچاوەکانی "کوردستان" (١٨٩٨-١٩٠٢)، "کورد تەعاون و تەرەقی گازیتەسی" (١٩٠٨-١٩٠٩)و ژین (١٩١٨-١٩١٩) لەو کۆمەڵە بەرهەمە کەڵکم وەرگرتووە کە محەمەد ئەمین بوزئەرسەلان کۆیکردووەتەوە و چاپی کردووە.

٧- گەلێ لە بیرمەندە زمانی و ئەدەبییەکان ئاماژەیان بە گرنگی دەوری خوێنەر لە یارمەتیدان بە واتای دەقەکان یا دەوری "تێگەیشتن لە دەق" وەک بەشێکی گرنگی ئەدەبیات کردووە. ژان پۆل سارتێر بۆ نموونە دەڵێت: "هەموو دەقێکی ئەدەبی بەرهەمی تێگەیشتنی خوێنەرەکەیەتی، لەوانە ئەو وێنایە کە ئەو دەقە بۆ کێ نووسراوە. کەوابوو، ئەو وتارانەش کە لە چاپەمەنی کوردیدا بڵاو کراونەتەوە، بەڵام بەتایبەت باسی مەسەلەی کوردیان نەکردووە بە وتارگەلی کوردی لە قەڵەم دەدرێن، چونکە بۆ موخاتەبی کورد نووسراون. بیندیکت ئاندیرسۆن ئاماژە بە گرنگی دەوری خوێنەر لە چاپەمەنیدا دەکات بە تایبەت لە ڕەوتی مێژوویی دروستبوونی شووناسی نەتەوەییدا. بەشێک لە هەڵێنجاندنەکەی ئاندیرسۆن دەربارەی دەستەواژەی "کاپیتالیزمی چاپ" کە پەیوەندی بەم باسەی ئێمەوە هەیە ئەو پەیوەندییەیە کە ئەو لە نێوان سەرهەڵدانی ڕۆژنامە (کە پەیامەکەی یارمەتی بە وێناکردنی کۆمەڵگە لە

پاڵ هێڵە نەتەوەییەکاندا دەدات) و خوێنەرێک کە خۆی هەستدەکات لەگەڵ خوێنەرانی دیکەدا پەیوەندی هەیە، دایدەنێت. بنواڕن بۆ ئاندیرسۆن (١٩٩٣:٣٣-٣٦)

٨- کوردەکان تەنها کەسانێک نەبوون کە بایەخی ئەم دیاردەیان دەزانی. ئەم دواییانە من لێکۆڵینەوەیەکی سەرنجڕاکێشم بینی کە باسی شوێنێکی بە تەواوی جیاواز لە جیهاندا کردبوو کە نووسەرەکەی ئاماژەی بە بەریانێکی هاوشێوە بۆ پەیوەندی نێوان دەوڵەت -نەتەوە و مۆدێرنیتە لەگەڵ خۆشبەختیدا کردبوو. بەرهەمەکەی دەیڤید نوگینت بە ناوی:

**Modernity at the edge of empire: state, individual and nation In the northern Peruvian Andes: 1885-1935)1997**

ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە چۆن شتگەلێک وەک تیجارەت، مۆدێرنیتە و نەتەوە- دەوڵەت وەک هێزگەلی ڕزگاریدەر (نە هێزی مەترسی) کە دەبێ پێشوازییان لێبکرێت (لە باتی ئەوەی کە بەرەنگارییان لە گەڵدا بکرێت) سەیر دەکران (١٢-٣).

٩- بنواڕن بۆ بیروبۆچوونەکانی بیندیکت ئاندیرسۆن دەربارەی کاپیتالیزمی چاپ و ناسیونالیزم (٣٣:١٩٩٣-٣٦)

١٠- هەندێ لە وتارەکان باسی مەسەلە کوردییەکانیان کردووە وەک ئەو ڕووداوگەلە ناوچەییانە کە لە ناوخۆدا پەیوەندییان پێکەوە هەبوو و چالاکییە ناسیوناليستییەکانی ئەرمەنییەکان و هەروەها "حمیدیە سواری ئالایلاری" کە سوپایەکی ناتەکوزمەند بوو (کە لەسەر بنەمای نموونەی هێزە قەزاقەکانی ڕووسیا) دروستکرابوو کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ساڵی ١٨٩٠-١٨٩١ دروستی کرد بۆ ئەوەی ببێ بە پۆلیسی ڕۆژهەڵاتی ئاناتولی و زۆرتر بۆ ئەوەی دژی ڕاپەڕینەکانی ئەرمەنییەکان ڕابوەستێت. یەکینەکانی ئەم سوپایە لە عەشیرەتە کوردەکان پێکهاتبوو و ئەو پاداشت و خەڵاتانەش کە سوڵتان دەیدا بە هەندێ کەسی تایبەت لە ناو چاپەمەنی کوردیدا باس دەکرا و بەهۆی ئەوەی کە ئەم مەسەلانە چالاکییە سەرەکییەکانی ناوچە بوون، نووسەرانی کورد لە ساڵی ١٨٩٨ تا ساڵەکانی پێش لە هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە سەریان چڕ دەبوونەوە.

١١- بنواڕن بۆ بەرهەمەکەی ئەم نووسەرە بە ناوی:

**Claiming the Nation: the origins and nature of, Kurdish press in the Ottoman Empire), 1996**

٦-١٢ وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، کورد هانیمی (خاتوونی کورد)،" ژین"، ژمارەی ١٤، مارسی ١٣٣٥-١٩١٩: لاپەڕەی ٦

٦-١٣ یوسف ئاکچورک لە بەرهەمەکەی خۆیدا (١٩٠٧) ئەو ڕێگا سیاسی و شارستانیانە دەخاتەڕوو کە لەو سەردەمەدا لەبەردەم عوسمانی بوو واتا ڕۆژئاواچێتی، ئیسلامچێتی و تورکیچێتی و خۆیشی لەگەڵ تورکیچێتییەکەدایە. زیا گوگاڵپ لە گەلێ لە بەرهەمەکانیدا لە دەستەواژەگەلی هاوشێوە کەڵک وەردەگرێت و لە کاتێکدا کە داکۆکی لە "تورکچێتی"دەکات خوازیاری ئەوەیە کە ئەم سێ ڕێگایە پێکەوە تیکەڵ بکرێن بۆ ئەوەی "شارستانییەکی نوێ" دروست بکرێت. بۆ کۆمەڵێک لە نووسراوەکانی زیا گوگاڵپ لەم پەیوەندییەدا بنواڕن بۆ بەرهەمەکەی نیازی بەرکەس (١٩٥٩).

٦-١٤ گەلێ لە لێکۆڵەرە سەرەکییەکانی تورکیا درێژەیان بەو ڕێگایە داوە کە ئاکچورک و گوگاڵپ دایاننا و بە نیشاندانی هەندێ لە نموونەکانی ئەم مەسەلەیە، کۆمەڵێک دەستەواژەیان لە بواری لێکۆڵینەوە لە بارەی مێژووی ئەم دواییانەی عوسمانی و مێژووی نوێی تورکیا خستووەتەڕوو، بۆ نموونە بنواڕن بۆ تێزی دکتۆراکەی تونایا (١٩٤٨) و کتێبەکەی بە ناوی "تورکیادە سیاسال پارتیلەر" (١٩٨٤). هەروەها بنواڕن بۆ:

**The genesis of young ottoman thought: a study in the modernization of Turkish political ideas) 1962(and niyazi berkes: the development of secularism in Turkey) 1964**

٦-١٥ بۆ زانیاری دەربارەی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەنووسی عوسمانی لەم بوارەدا، بۆ نموونە بنواڕن بۆ ماردین (١٩٦٢:بەشی ٧-١٠) و لیویس (١٩٦٨:١٤٦-١٥٠).

٦-١٦ هانی ئۆغلو لە سەرەتادا CUP وەک ڕێکخراوێک وەسف دەکات کە کۆمەڵی گروپگەلی نزیکی لە دەوری یەک کۆ کردبووەوە کە خاڵی هاوبەشی کەمیان پێکەوە هەبوو جگە لەوە کە خوازیاری زانست و پێشکەوتن و لەسەر دەسەڵات لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٩٩٥:١٣) بوون.

١٧- دوو لێكۆڵەر كە لەسەر ناسیونالیزمی عەرەب لێكۆڵینەوەیان كردووە، ئەم خاڵەیان بە جوانی نیشانداوە. ڕەشید خالیدی ئاماژە بە گرنگی چاپەمەنی و بیروڕای گشتی دەكات (بنواڕن بۆ خالیدی: ١٩٨٤). جیمز گەلوین نیشانیداوە كە چۆن ئاڵوگۆڕە بەرفراوانە كۆمەڵایەتی و ئابوورییەكان لە ئیمپراتۆری عوسمانی لە سەدەی ١٩ یارمەتی بە گۆڕینی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان و دامەزراوەكان دا و چۆن ڕێكخراوە كۆمەڵایەتییەكان كەوتنە پاڵ پەیوەندییە نەتەوەیی و ڕێكخراوەییەكاندا و ئەمانەش بۆ خۆیان بە خاڵە ئیدۆلۆژیكە لە یەك نزیكەكان كە خەڵكی سوریایان بە یەكەوە دەبەستەوە، بەهێز دەكران (گالوین: ١٩٩٤)

١٨- بنواڕن بۆ پەراوێزی ٣، بیندیكت ئاندیرسۆن دەربارەی كاپیتالیزمی چاپ و ناسیونالیزم.

١٩- من نەمتوانی هیچ وتارێك لە "كوردستان" (١٨٩٨-١٩٠٢) یا "كورد تەعاون و تەرەقی گازیتەسی" (١٩٠٨-١٩٠٩) دەربارەی ژن بدۆزمەوە.

٢٠- دكتۆر عەبدوڵڵا جەودەت:"بیر خیتاب" (موخاتەبێك)،"ڕۆژی كورد"، ژمارە١ (٢ی حوزەیرانی ١٣٢٩-١٥ی ژوەنی ١٩١٣، لاپەڕە٣)

٢١- ئەم ١٢ خاڵە بۆ گروپە جۆراوجۆرەكانی عوسمانی پێناسەیەكی ناڕوونی بۆ خۆبەڕێوەبردن هەبوو: دەیانگوت توركەكانی ئیمپراتۆری عوسمانی دەبێ خاكێكی یەكپارچەیان هەبێت، بەڵام نەتەوەكانی دیكە كە ئێستا لەژێر دەسەڵاتی توركەكاندان دەبێ ئاسایشی ژیانیان زامن بكرێت و دەرفەتی خۆبەڕێوەبردنی كاروباری خۆیان پێبدرێت.

٢٢- ئەرگەنی مادەنلی:"كوردلەردە كادین مەسەلەسی"، لاپەڕە١٢.

٢٣- ئەرگەنی مادەنلی:"كوردلەردە كادین مەسەلەسی"، لاپەڕە١٢.

٢٤- بۆ نموونە بنواڕن بۆ وانلی مەمدوح سەلیم بەگ:"ئیكی عەسری مەبرور: كورد كادینلاری تەعالی جەمعییەتی وە كورد تەلەبە هیوی جەمعییەتی"،"ژین"، ژمارە ٢٠ (٤ی حوزەیرانی ١٣٣٥-٤ی ژوەنی ١٩١٩)

٢٥- بەدرخان موحەمەد عوسمان:"کوردلوک و کوردستانی پاشاتبیلمەک"، "کوردستان"، ژمارە٨ (٢٩ی مایسی ١٣٣٥-٢٩ی مای ١٩١٩، لاپەڕەی ٩٨)

٢٦- بۆ نموونە"کوردستان تەعالی جەمعییەتی" (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان)،"کورد تەعمیمی مەعاریف جەمعییەتی" (کۆمەڵەی پەرەپێدانی فێربوون)ی هەڵوەشاندەوە کە پێش لە هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی دامەزرابوو. ئەم کۆمەڵەیە بلاڤۆکێکی بە ناوی "ژین"بڵاو دەکردەوە کە نیشانی دەدات ڕۆشنبیران چەندە گرنگییان بە دەوری پەروەردە لە کۆمەڵگەکەیاندا داوەو چۆن ویستوویانە بەم ئامانجە بگەن. بەرنامە ١٢ خاڵییەکەی وۆدرۆ ویڵسۆن لە "ژین"دا بڵاو بووەوە و تێیدا داوا کراوە کە کتێبی ڕێزمان و فەرهەنگی کوردی بڵاو بێتەوە، بەرهەمی شاعیرانی کورد کۆ بکرێتەوە، کتێبخانە و ڕێکخراوەگەلی پەروەردەیی دابمەزرێن، قوتابخانەی شەوانە بۆ ئەو کوردانەی کە بە ڕۆژ کار دەکەن بکرێتەوە، مامۆستا پەروەردە بکرێت و کچە هەتیوەکان فێری کار و پیشەیەکی کچانە بکرێن. بۆ تەواوی ئەم بەرنامەیە بنواڕن بۆ :"کورد تەعمیمی مەعاریفی جەمعییەتی بەیاننامەسی،"ژین"، ژمارە٢ (٢ی شوباتی ١٣٣٥-٢ی فوریەی ١٩١٩: لاپەڕەی ١٤-١٦)

٢٧- ولنلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)،" ژین"، ژمارەی ٦

٢٨- ولنلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)،" ژین"، ژمارەی ٦

٢٩- بۆ ئەم دیاردەیە بۆ نموونە بنواڕن بۆ سێن (١٩٩٣)، نەجمئابادی (١٩٩٨) و شاکری (١٩٩٨). ئەم وتارەی دواییە بە سەرنجدانی تایبەت بە چوارچێوەی کۆلۆنیالیستی سەیری ئەم دیاردەیە دەکات. وتارەکەی گایسکیل و ئونتیرهالتێر(١٩٨٩) بە تایبەت بەهۆی سەرنجدان بە دەوری دایکایەتی و گرنگی ئەم دەورە لە چوارچێوەی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووریدا، گرنگە.

٣٠- ولنلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)،" ژین"، ژمارەی ١٠

٣١- عەزیز یامولکی:"کورد کادینلاری تەعالی جمعییەتی موسامەرەسی موناسیبەتیلە"، "ژین "، ژمارەی ٢٥ (٢ی تشرینی ١٣٣٥-٢ی ئوکتۆبەری ١٩١٩، لاپەڕەی ١٤-١٥).

٣٢- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)،٦:١٩١٩-٧

٣٣- عەبدەلرەحیم رەحمی (ژ مالا حەکاریان، ژ بۆ جیواتا دایکان)، " ژین"، ژمارەی ٢٢ (٢ی تەموزی ١٣٣٥-٢ی جولای ١٩١٩، لاپەرەی ١٦).

٣٤- رێژەی خوێندەواری ئەو کاتە لە ناو ئیمپراتۆری عوسمانیدا بە زۆر نەدەگەیشت بە ١٠ لە سەد و لە کوردستاندا ئەم رێژەیە لەوەش کەمتر بوو. رێژەی خوێندەواری هەتا ماوەیەکی زۆر پاش ئەوە زیادی نەکرد.

٣٥- ئیسماعیل حەقی بابازادە:"کوردچەیە دەیر": کورد تەعاون و تەرەقی گازیتەسی٣ (٦ی کانونی ئەوەلی ١٣٢٤-١٩ی دیسامبری ١٩٠٨، لاپەرەی ١٨)

٣٦- ئیسماعیل حەقی بابازادە:"کوردچەیە دەیر": کورد تەعاون و تەرەقی گازیتەسی٣ (٦ی کانونی ئەوەلی ١٣٢٤-١٩ی دیسامبری ١٩٠٨، لاپەرەی ١٨)

٣٧- ئەو پێشەکییە کە موکوسلو حەمزە بۆ چاپی مەم و زین لە ساڵی ١٩١٩ دا نووسیویە. مەم و زین بەناوبانگترین حیماسەی کوردییە کە کوردە ناسیونالیستەکان نەک تەنها وەک بەرهەمێکی ئەدەبی، بەڵکو وەک بەرهەمێکی ناسیونالیستیش سەیری دەکەن (بوزئەرسەلان لە پێشەکی مەم و زین دا ئاماژەی بە "ژین" (١٩١٩) کردووە.

٣٨- بۆ نموونە ئەو تێبینییە کە لە"ژین" (١٩١٩)دا نووسراوە.

٣٩- کوردێ بیتلیسی (خەلیل هایالی): "کوردچەیە دەیر٢": "ژین"، ژمارە ١٥ (٣٠ی مارتی ١٣٣٥-٣٠ی مارسی ١٩١٩: لاپەرە ١٤)

٤٠- " کوردستان مەکتوبلەری ٣"، "هەتاوی کورد٣" (٢٩ی کانونی ئەوەلی ١٣٢٩-١٠ی ژانویەی ١٩١٤: لاپەرەی ١٥-١٦)

٤١- ئەرگەنی مادەنلی:"کوردلەردە کادین مەسەلەسی"، لاپەرە١٢

٤٢- بەشداریکردنی ژنان لە کارو چالاکی کولتوریدا لە ناو بزوتنەوە ناسیونالیستی و (ئاییینیەکاندا) زۆر لە لایەن لێکۆڵەرانەوە کە لەسەر گروپە جۆراوجۆرەکاندا لێکۆڵینەوە دەکەن، ئاماژەی پێکراوە. بۆ نموونە دنیز کاندیۆتی (١٩٩١) ئاماژە بەوە دەکات کە چۆن تورکە ناسیونالیستەکان و عوسمانییە ئیسلامچییەکان "ژن"یان وەک بەردی بناغەی یەکگرتوویی کولتووری عوسمانی " و کۆڵەکەی "یەکگرتوویی کولتووری

له بەرامبەر ڕەوتی ڕۆژبەڕۆژ ڕوو لە زیادبوونی ڕۆژئاواچێتی"دا پێناسە دەکرد. بۆ نموونەگەلی هاوشێوە لەم پەیوەندییەدا بۆ نموونە بنواڕن بۆ چاترچی (١٩٩٣) و (١٩٩٠) و واریکاس (١٩٩٣)

٤٣- دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کە لە کاتێکدا کە ئەمە یاسایەکی گشتییە، بەڵام کۆمەڵێک ناوازەیشی هەیە. ئەندامانی گروپە ئەتنیکییەکانی دیکە، بە تایبەت نوخبەکان بۆ ڕاگرتنی یەکپارچەیی ئیمپراتۆری عوسمانی کاریان دەکرد چونکە قازانجیان لەوەدا بوو. ئەم مەسەلەیە بۆ نوخبەکانی زۆربەی گروپە موسڵمانەکانی عوسمانی (لە ناویشیاندا کوردەکان) هەتا پاش جەنگی یەکەمی جیهانی وەڕاست دەگەڕا.

٤٤- بیندیکت ئاندیرسۆن ئاماژە بەوە دەکات کە ناسیونالیزمی فەرمی زۆرتر لە وەڵامی بزووتنەوە ناسیونالیستییەکاندا کە ئەتنیکیتر، مەحەلیتر یا تایبەتترن و هەڕەشە لە یەکپارچەیی خاکی ئەو حکومەتە دەکەن، سەرهەڵدەدات.. کەوابوو عوسمانیچێتی دەکرێت لانیکەم وەک وەڵامی حکومەت بە بزوتنەوە جیاجیاکانی بالکان کە لە نێو گروپە کریستیانەکان لە سەرەتای سەدەی ١٩دا دەستی پێکرد، وەسف بکرێت. وەک جۆریک "سوپرا ناسیونالیزم" کە بۆ یەکخستنی هەموو گروپەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دانرابوو موسڵمان و ناموسڵمان وەکو یەک لایەنگرییان لە عوسمانی دەکرد، بەو هیوایە کە پێش لە یەکهەڵوەشانەوەی زیاتری ئیمپراتۆری عوسمانی بگرن. ڕیفۆرمەکانی "تەنزیمات" دەبێ لەم چوارچێوەیەدا سەیر بکرێت.

٤٥-بە وتەی ستاورۆ سکاندی کوردەکان تەنها گروپێک نەبوون کە گلەییان لە "سیاسەتە بە تورککردنەکان" دەکرد و ئالبانیاییەکان لە بەرامبەر ناوەندچێتی و سیاسەتی "تەنها زمانی تورکی" ڕاوەستان (١٩٦٧، بۆ نموونە ١٤٤،٩٠) و گەلێ لە نووسەران ئاماژەیان بە وەڵامی بەهێزی گروپە عەرەبەکان بەم سیاسەتانە کردووە (بۆ نموونە بنواڕن بۆ خوری:١٩٨٣:٥٨-٥٩). بەهەرحاڵ دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کە نووسەرانی دیکە ئەو چوارچێوەیان بردووەتە ژێر پرسیار کە تێیدا ناسیونالیزمی

عەرەب وەک وەڵامێک لە بەرامبەر ناسیونالیزمی ڕوو لە زیادبوونی تورک لەم قۆناغەدا سەریهەڵدا. بۆ نموونە هانی ئوغلو ئاماژە بەوە دەکات کە ناسیونالیزمی تورک پێش لە ١٩٠٨ دەستی کرد بە زاڵبوون بە سەرcup دا (بنواڕن بۆ هانی ئوغلو:١٩٩١). هەروەها نابێ وابیر بکەینەوە کە هەموو ناسیونالیستەکان لایەنگری هەموو سیاسەتە پاوانخوازانەکانی تورکیا بوون.

٤٦- ئەو شتانەی کە دەربارەی بەتورکبوونی ژناندا پێشتر باسمان کرد کە لە "ڕۆژی کورد" و "هەتاوی کورد"دا بڵاو بووەوە.

٤٧- کەمال فەوزی: "حکومەتی حازریا ئاچیک مەکتوب"(نامەیەکی کراوە بۆ حکومەتی ئێستا): "ژین": ١٠ی مارتی ١٣٣٥-١٠ی مارسی ١٩١٢: لاپەڕە ٢). هۆکاری توڕەیی ڕۆشنبیرە کوردەکان، وتارێک بوو کە "ئیدارەی گشتی کۆچبەران و عەشیرەتەکان" دەربارەی کورد پاش جەنگی جیهانی بڵاوی کردەوە. کوردی بیتلیسی لە وتارێکدا لەژێر ناوی "ئەفسانەی زەحاک: بە نیسبەت وتارێک بە ناوی کوردەکان لە لایەن ئیدارەی کۆچبەران" ئەم وتارەی ئیدانە کرد و نووسەرێکی دیکە لە وتارێکی مێژووییدا دەربارەی بنەماڵەی بابان نووسی: "چەندە سەرسوڕهێنەرە کە ئیدارەی گشتی عەشیرەتەکان و کۆچبەران کتێبێکی بە ناوی "کوردەکان" بڵاو کردووەتەوە کە تێیدا هاتووە: "وشەی بەبە لە زمانی تورکیدا بە واتای منداڵە و ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە کە دەیسەلمێنێت کە سلسلەی بابان تورکن و کەوابوو بنەماڵەی بابانیش تورکن و بەم شێوەیە پشتیوانی لە تورکیزم و تورانیزم دەکات بێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە بابانەکان خەڵکی ئێرانن (کورد تاریحینده بابان هانەدانی،"ژین"، ژمارە ٩، ١٦ای کانونی سانی-کانونی دووەم ١٣٣٥-١٦ای ژانویەی ١٩١٩، لاپەڕەی ٢). لە شوێنێکی دیکەدا نووسرابوو : "گەلێ کۆچبەری کورد هەن کە ناچنە لای کاربەدەستانی حکومەت کە لە ئیدارەی عەشیرەتەکان و کۆچبەراندا کار دەکەن، چونکە زمانی فەرمی نازانن و دەیانەوێت خۆیان لە سیاسەتی بەتورککردن دوور بگرن و نەچنە خزمەتی سەربازی. ئەم کەسانە بە گوێرەی تێڕوانینی ئەحمەد ئاغایۆف، زیا

گوگالپ و سولەیمان نەزیف کورد نین ("کوردستان": ژمارە ٨، ٢٩ی مایسی ١٣٣٥-٢٩ی مای ١٩١٩، لاپەڕە ٤)

٤٨- نموونەی ئەم نووسراوانە ئەو کۆمەڵە وتارانەیە کە کوردی بیتلیسی (خەلیل هەیالی) لەژێر ناوی " کوردلەر ئیرانی دەگیل مەدیر؟ "(کوردەکان ئێرانین، تورک نین؟)، لە بڵاڤۆکی "ژین" دا (ژمارە ١٨، ١٩، ٢٠ و ٢١ ١٠ی مارتی ١٣٣٥-١٠ی مارسی ١٩١٢: لاپەڕە ٢) بڵاوی کردەوە.

٤٩- ولئلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)، ژمارەی ٦

٥٠- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)، ژمارەی ٥

٥١- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)، ژمارەی ٧

٥٢- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)، ژمارەی ٨

٥٣- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)، ژمارەی ٩

٥٤- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)، ژمارەی ٨

٥٥- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی، ژمارەی ٨-٩. شایانی ئاماژەپێکردنە کە ئەو کەسەی لەم بەسەرهاتەدا چاوی بڕیوەتەوە نامووسی ئەو ژنە، کورد نییە. سەلیم بەگ دەڵێت: من بیستوومە کە ئەم بەسەرهاتە لە گوندێکی کورددا ڕوویداوە. کەوابوو ئەو ڕاستییە کە لێکۆڵەرێکی باوەڕپێکراو و بەناوبانگ) کە لە ناو یەکێک لە دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا لە ئیستانبول کار دەکات) دەڵێت: ئەم شتە ڕوویداوە، بەڵگەیە کە شتێکی وا ڕوویداوە.

٥٦- وانلی مەمدوح سەلیم بەگ، "کورد هانیمی (خاتوونی کورد)، ژمارەی ٩

٥٧- ئەرگەنی مادەنلی: "کوردلەردە کادین مەسەلەسی"، ژمارەی ١٢

٥٨- ئەرگەنی مادەنلی:"کوردلەردە کادین مەسەلەسی"، ژمارەی٢- ١٢

٥٩- هانی ئۆغلو لە کتێبەکەیدا بە ناوی "تورکە گەنجەکان لە ئۆپۆزیسیۆندا" ئەو ڕێگایە بە جوانی ڕووندەکاتەوە کە تێیدا داروینیزمی کۆمەڵایەتی و ماتیریالیزمی بیۆلۆژیکی لەناو نووسراوەکانی تورکە گەنجەکاندا لە سەرەتای سەدەی ڕابردوودا سەریهەڵداوە. بە وتەی هانی ئۆغلو شێوەی بیرکردنەوەی زۆریەی ئەندامانی سەرەتای CUP مۆرکی بەهێزی

بیرۆکەی داروینیزمی کۆمەڵایەتی پێوە دیار بوو کە تورکە گەنجەکان وەک ئامرازێک بۆ تێگەیشتن لە ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان سەیریان دەکرد. تورکە گەنجەکان لە نووسراوە سەرەتاییەکانیاندا بە توندی پشتیان بەم بیرۆکانە بەستبوو و پاشان ئەم شتە لە ناو تورکە گەنجەکاندا گشتگیرتر بوو بۆ ئەوەی ئەم بیرۆکانە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بە کار بەن. ڕۆشنبیرانی کورد بەشێک بوون لەم ڕەوتە بەرفراوانترەی ڕۆشنبیرانی عوسمانی و دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە هەندێ لە کەسایەتییە ناسیونالیستە سەرەکییەکانی کورد (وەک میقداد میدحەت بەدرخان، عەبدولڕەحمان بەدرخان و عەبدوڵڵا جەودەت) کە لە "کۆمیتەی یەکێتی و پێشکەوتن "ی عوسمانی(CUP))یا بزووتنەوەی تورکە گەنجەکاندا چالاک بوون لەو شتەدا شەریک بوون کە هانی ئەغلو ناوی دەنێت:"والتانشانگی تورکە گەنجەکان بۆ زانست و پێشکەوتن."

٦٠-گۆڵد (١٩٨١:٢١)

٦١- بۆ نموونە بنواڕن بۆ لوتفی فیکری :"کورد میلییەتی"،"ڕۆژی کورد٤" (٣٠ی ئابی ١٣٢٩، ٣٠ی ئەیلوولی ١٩١٣، لاپەڕەی ٣)

٦٢-بۆ نموونە بنواڕن بۆ"بولگاریستانلی دوگان، میلییەتینیزە کارشی وەزیفونیز (ئەرکی ئێوە لە بەرامبەر نەتەوەکەتان)، "ڕۆژی کورد"، (٦ی تەموزی ١٣٢٩-١٩ی جولای ١٩١٣: لاپەڕە ٢)

٦٣- بۆ نموونە بڕوانن بۆ: "فەحری،" کوردلەردە قابیلییەتی تەمەدون (توانایی کوردەکان بۆ ئەوەی ببن بە شارستانی)، "ڕۆژی کورد"، (٢ی حوزەیرانی ١٣٢٩-١٥ی ژوەنی ١٩١٣: لاپەڕە ٢-١١). ئەم نووسەرە وەک کەسانێک کە لە ڕووی بیۆلۆژیکییەوە (ڕەگەزییەوە) توانایی ئەوەیان نییە ببن بە مۆدێرن (واتا ببن بە شارستانی) سەیری خەڵکانی غەیرە ڕۆژئاوایی ناکات و دەنووسێت: "شیکردنەوەیەکی ئەم یاسا سروشتییە مێژووییە کە هەمیشە لە ژیانی مرۆڤدا زاڵ بووە نیشاندەدات کە هۆکاری ئەوەی کە ئەم هێزی شارستانییە لەنێو نەتەوەی کورددا سەریهەڵنەداوە ئەوە نییە کە کوردەکان توانایان نییە ببن بە شارستانی، بەڵکو بەهۆی نەبوونی ئەو فاکتۆرە پێشخەرانەیە کە وا لە نەتەوەکان دەکات کە پێشبکەون و بگەنە هەندێ لە قۆناغە

تایبەتەکانی شارستانی. بەهەرحاڵ ئەگەر ئێمە لە ڕوانگەی یاسای سروشتەوە سەیری ئەم مەسەلەیە بکەین، دەتوانین بڵێین ئەگەر ئەو گیروگرفتانە کە لە ئەنجامی بارودۆخی محەلیدا سەریهەڵداوە نەمێنێت و فاکتۆرگەلی نوێی پێشکەوتن بێنە ناو کۆمەڵگە، ئەو کاتە دەبینین کە کوردەکان لە ڕووی پێشکەوتنەوە دەبن بە خاوەن چی داهاتوویەکی ڕوون.

٦٤- بنواڕن بۆ گۆڵد (١٩٨١). هانی ئۆغلو هەروەها نیشانیداوە کە چۆن ڕۆشنبیرانی عوسمانی ئاگاداری لێکۆڵینەوەکانی ئەوروپییەکان لەسەر ڕەگەز و کاسەی سەری مرۆڤ بوون و سەرجەم تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەیان بە گوێرەی باڵادەستی فیزیۆلۆژیکی پۆلێنبەندی دەکرد، بە تایبەت ئەنجامی دۆزینەوەکانی لیبۆن کە بە گوێرەی ئەوە:" کاسەی سەری ڕۆشنبیران لە گوندییەکان و کەسانی خزمەتکار گەورەترە". لە ڕاستیدا عەبدوڵلاَ جەودەت کە ناسیونالیستێکی کوردی ناسراو بوو، یەکێ لە سەرەکیترینی ئەو کەسایەتیانە بوو کە باوەڕی بەم بیرۆکانە هەبوو (بنواڕن بۆ هانی ئۆغلو٢٣:١٩٩١).

٦٥- شیبینگیر(١٩٨٧) جەختی لە سەر ئەم خاڵە کردووەتەوە.

٦٦- ئەمە قسەکانی "چاترچی"یە (٢٣٦:١٩٩٣)

٦٧- دەبێ مرۆڤ باش لەم خاڵە تێبگات. ڕاستە کە گەلێک لە خەڵک پێشوازییان لە ناسیونالیزم دەکرد، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە تەنها ڕێگای ڕووناککەرەوەی کۆمەڵگەی نوێ بوو و بزووتنەوەیەک بوو کە حەتمەن دەبوایە بگیردرایەبەر. لەم پەیوەندییەدا بنواڕن بۆ بەرهەمەکەی بالیبار و والیرستەین (١٩٩١.٨٩) و ابوالحاج (٦٣:١٩٩١-٦٤). هەروەها دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە تاکەکانی نەتەوەیەک حەتمەن بەشدارییان لە بزوتنەوەی نەتەوەیی خۆیاندا نەدەکرد، بەڵکو بۆ بزوتنەوە نەتەوەییەکانی دیکە کاریان دەکرد. سولەیمان نەزیف و زیا گوگالپ کورد بوون، بەڵام ڕێگایەکی دیکەیان هەڵبژارد (زیا گوگالپ لە ڕاستیدا بە باوک و دامەزرێنەری ناسیونالیزمی تورک دادەنرێت). لە ئەنجامدا ئەم جۆرە کەسانە هەمیشە لە لایەن کوردە ناسیونالیستەکانەوە وەک خایین سەیر دەکرێن.

# سەرچاوەکان:

Hetawi Kurd (1913-1914), (1, 2, 3, 4, 5-10), Istanbul

Jin (1918-1919) (1-25), Istanbul, republished by M. Emin Bozarslan, Upssala, Wesanxana Deng, 1985

Kurd Teavin Ve Terakki Gazetasi (1908-1909), Istanbul, republished by M. Emin Bozarslan, Upssala, Wesanxana Deng, 1998

Kurdistan (1898-1902) (1-9, 11, 13-16, 2031), Cairo, Genewa, London, Folkestone, republished by M. Emin Bozarslan, Upssala, Wesanxana Deng, 1991

Kurdistan, (1919) (8-9), Istanbul

Roji Kurd (1913) (1-4), Istanbul

Abou El-haj, Rifaat Ali (1991), formation of the modern state: the Ottoman Empire sixteenth to eighteenth centuries, Albany: suny

Akcura, Yusuf (1907)Uc tarsi Siyaset .Cairo,Matbaa-y Ictihad

Anderson,Bendict (1993): Imagined Communities: Reflections on The Origins and Spread of Nationalism , revised, London, verso

Badran Margot (1991), competing agenda, feminists, Islam, and the state in the nineteenth –century Egypt, in Deniz Kandiyohi(ed): women, Islam and the state, Philadelphia: temple university press.

Balibar Etienne and Immanuel Wallenstein (1991): Race. Nation, class: Ambiguous Identities, London: verso

Baron Beth (1993): The construction of national honor in Egypt, Gender and history

Berkes Niazi(1964):the development of secularism in turkey Montréal: McGill university press

Berkes Niazi(1959):Turkish nationalism and western civilization: selected essays of Ziya Gokalp,London:georg Allen and Unwin

Chatterjee Partha(1993) ,The nation and its fragments, colonial and post colonial histories, Princeton, Princeton university press

Chatterjee, Partha(1990),the nationalist resolution of the women question: Inkumkumsangari and Sudesh Vaid(eds): Recasting women :essays in Indian colonial history ,new Brunswick, Rutgers university press.

Cuinet,Vital(1891):la Turquie de l Assie,2, Paris,imprimerie A.Burdin

De Groot Joanna (1993), tag dialectics of gender: women, men and political discourses in Iran: 1890-1930, gendr and history2

Eagleton Terry (1996), literary theory: an Introduction, second edition, Minneapolis: university of Minnesota press.

Fromkin David (1989): A peace to end all Peace: The fall of Ottoman Empire and the creation of the modern Middle East: New York: Avon

Gaitskell, Deborah and Ellain Unterhalter(1989) : Mothers of the nation :a comparative analysis of nation :race and motherhood in Afrikaner nationalism and African national congress ,in Nira Yuval–Ddavis and Floya Anthias (eds),woman-nation-state, London, Macmillan

Galvin James (1994): The social origins of popular nationalism in Syria: evidence for a new framework: international journal of Middle Eastern studies, 26

Gould Stephen jay (1981) the Mismeasure of man, Newyork, w.w Norton

Hanioglu, M,Sukru(1991):The young Turks and the Arab before the revolution of 1908,in Rashid Khalidi et al(eds),the origins of Arab nationalism ,New York, Colombia university press.

Hanioglu, M,Sukru(1995):the young Turks in opposition, new York, oxford university press

Kandyoti Denis (1991): end of Empire: Islam, nationalism and women in turkey, in Kandyoti Denis(ed): women, Islam and the state, Philadelphia temple university press

khalidi Rashid(1984): Social factors in the rise of Arab movement in Syria, in Said Amir Arjomand (ed),from nationalism to revolutionary Islam, Albany: SUNY

Khoury Philiph s(1983)urban notables and Arab nationalism: the politics of damascuse:1860-1920,New York ,Cambridge university press

Klein Janet (1996): Claiming at Nation: The origins and the nature of Kurdish nationalist discourse: a study of the Kurdish press in the Ottoman Empire .ma thesis: Princeton University

Lewis Bernard (1968), The emergence of modern Turkey, second ed , London, oxford university press

Mardin Serif (1962): The genesis of young ottoman thought: A study in the modernization of Turkish political ideas, Princeton, Princeton university press

Nugent David (1997): Modernity at the edge of Empire: state individual and the northern Peruvian Andes, Stanford University press

Schiebinger Linda (1987), skeletons in the closet: the first illustrations of the female skeleton in eighteen century Anatomy. In Catherin Gallagher and Thomas lacquer (eds): The making of the modern body: sexuality and society in the nineteen Century, Berkeley: university of California press.

Scot, Joan Wallach (1998): Gender and the politics of history, New York, Colombia university press

Sen Samita(1993):motherhood and mothercraft :Gender and nationalism in Bengal: gender and history

Shakry Omnia(1998): Schooled mothers and structured play: Child rearing in turn of the century Egypt: in Lila Abu-Lughod(ed): Remaking women feminism and the modernity in the middle east, Princeton, Princeton university press

Skendi Stavro(1967):the Albanian national awaking , Princeton, Princeton university press

Tunaya Tarik Zafer (1948):Ammes Hukukmuz Bakimindan Ikinci Mesrutiyet fakir ceryanlari, unpublished PhD dissertation ,Istanbul, university

Tunaya Tarik Zafer (1984):Turkiyade Siyasal partiler, second ed, Istanbul: Hurriyet Vakfi Yayinlar

Varikas Eleni(1993): Gender and National Identity in fin de siècle Greece. Gender and history 5(2(

# بەجیهانیبوون و ناسیونالیزمی کورد
# لە دەرەوەی وڵات
## ئاندرو کورتیس

خەڵکی جیهان، ئیدی لە گۆشەگیریدا ناژین، ڕەوتەکانی بەجیهانیبوون جیهانی بچووکتر کردووەتەوە، بەڵام جیهان تەنها یەک کولتووری و یەک زمانی نییە. پەیوەندییەکانی نێوان خەڵک بووەتە هۆی دروستبوونی شوناسە نەتەوەییەکان و گروپە ئەتنیکییەکان. لەوە زیاتر بەجیهانیبوون ئەتنیکەکانی جیهانی بڵاو و پژ کردووەو تەنها چەند دەوڵەت- نەتەوەیەکی یەکدەستی هێشتووەتەوە.

ئەمڕۆ ناسیونالیزم تەنها بە ناوچەیەکی تایبەت سنووردار نییە، چونکە بەجیهانیبوون نەتەوەکانی پەخش و بڵاو کردووەو ئەوانی لە وڵاتی خۆیان هەڵکەندووە. ئەم پەخش و بڵاوبوونەوەیەی خەڵک، جۆرە ناسیونالیزمێکی نوێی دروستکردووە کە لە دەرەوەی سنووری وڵاتێکی تایبەتدایە.

دەستەواژەی دیاسپۆرا سەرەتا بۆ وەسفکردنی خەڵکی جولەکە، کە لە سەراسەری جیهاندا پەخش و بڵاو ببوون بەکار دەبرا، بەڵام بەهەرحاڵ ئێستا بۆ وەسفکردنی ئەو خەڵکە بەکاردەبرێت کە لە دەرەوەی وڵاتی باوباپیرانی خۆیان پەخش و بڵاوبوونەتەوە و شوناسێکی نەتەوەیی

بەهێزیان هەیە و ئارەزوو دەکەن بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. دیاسپۆراکان لە وڵاتی خۆیان هەڵکەندراون، بەڵام وڵاتی خۆیان قەد لەبیر نەکردووە و بە هەر هۆیەک بێت هۆشیاری نەتەوەیی خۆیان بە توندی پاراستووە بێ ئەوەی دەوڵەتی خۆیان هەبێت.

گەلی کورد گەورەترین گەلی بێ دەوڵەتی جیهانە. ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان لە وڵاتی خۆیان هەڵکەندراون (زۆربەی جاران بە زۆر). کوردەکان دیاسپۆرایەکیان هەیە و من نموونەی کوردم وەک تەوەری توێژینەوەکەم بەکارهێناوە بۆ ئەوەی ئەو هێز و فاکتۆرانە شیبکەمەوە کە بوونەتە هۆی پێکهاتن و مانەوەی ناسیونالیزمی کوردی دوور لە وڵات.

## پێکهاتنی دیاسپۆرای کورد

کوردستان بە وڵاتی باوباپیرانی گەلی کورد دەگوترێت، هەرچەند کە قەد شوێنی ژیانی تەنها و تەنها کوردەکان نەبووە. لە سەدەی ١٦، کوردستان لە نێوان ئیمپراتۆری ئێران و عوسمانیدا دابەش بوو و پاش لەیەکهەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی، کوردستان دیسان بەسەر ئێران، عێراق، و تورکیادا دابەش بووەوە. ئەمڕۆ نیوەی کوردەکانی جیهان لە ناو تورکیا دەژین. بەهەرحاڵ هەروەها کە لەم وتارەدا باسی دەکەین، شێوەی ڕەفتاری دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ کوردەکان، دەورێکی گرنگی لە پێکهاتنی دیاسپۆرای کورددا بینیوە.

کوردە بێ دەوڵەتەکان قەد پێیان خۆش نەبووە ببن بە ژێردەستی ئەو دەوڵەتانەی کە ئێستا وڵاتی باوباپیرانی کوردەکانیان خستووەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. تورکیا ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە هیچ شوناسێکی ئەتنیکی

جیاواز لە تورکیا هەبێت و دەڵێت هەموو ئەوانەی لە تورکیا دەژین، تورکن. لە عێراق، دەوڵەتی دیکتاتۆری (بەعس – وەرگێڕ) قەد دانی بە وەدا نەناوە کە کوردەکان مافی بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان هەیە. لە دەیەی ١٩٢٠ تا ئێستا تورکیا چالاکانە بۆ لەناوبردنی کەمینەی کورد کار دەکات، بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٤ یاسای بنەڕەتی تورکیا قسەکردن بە زمانە غەیرە تورکییەکانی قەدەغە کرد و کوردەکانی لە بەکارهێنانی ناوە کوردییەکان و پەروەردە بە زمانی کوردی لە قوتابخانەکاندا بێبەش کرد .

دیاسپۆرای ئێستای کورد بەرهەمی ڕاستەوخۆی تاکتیکەکانی نەتەوەسازییە. گەلی کورد ئێستا گەلێکی دوور لە وڵاتە. شتێکی سەرسوڕهێنەر نییە کە کوردەکان لە دەیەی ١٩٢٠ دەستیان کرد بە ڕاپەڕین دژی سەرکوتی تورکیا کە بووە هۆی بەڕێوەبردنی سیاسەتگەلی توندو تۆڵتر لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە. لە ساڵی ١٩٣٤ دەوڵەتی تورکیا "یاسای سەرلەنوێ نیشتەجێبوونی"پەسەند کرد کە ڕاشکاوانە دەیگوت ئامانجی سەرەکی ئەوەیە کە خەڵکانی غەیرە تورک لە ناو کولتووری تورکەکاندا بتاوێنێتەوە، واتا ئامانجی سەرەکی ئەم یاسایە تاواندنەوەی کوردەکان بوو. لە ئاکامی جێبەجێبوونی ئەم یاسایە، گەلێ لە عەشیرەتە کوردەکان بە زۆر لە باشووری تورکیا دوور خرانەوە. هەم لە تورکیا و هەم لە عێراق سیاسەتەکانی ئەم دواییانە بووەتە هۆی دەربەدەربوونی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک و ملیۆنەها کورد ناچار کراون وڵاتی خۆیان بەجێبهێڵن.

ئەم تاکتیکە و تاکتیکەکانی دیکە، گەلێ لە کوردەکانی ناچار کردووە لە دەرەوەی وڵات بژین. گەلی کورد ناتوانێت میراتی کوردی خۆی لە

وڵاتی خۆیدا دەریببڕێت، بەڵام بەهەرحاڵ دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساوە لە وڵاتە لیبراڵەکانی ڕۆژئاوا میراتی خۆی بەکار بهێنێت و دەریببڕێت. ئەم مەسەلەیە بووەتە هۆی ئەوەی دیاسپۆرایەکی کوردی دروست ببێت و ئێستا کۆمەڵێک کۆمەڵگەی کورد لە وڵاتانی سەراسەری ئەورووپا دەژین. نموونەی کوردەکان نیشاندەدات کە چۆن کۆمەڵگەیەکی دیاسپۆرا دروست دەبێت. بە گشتی، دیاسپۆرا لە پەنابەرانی شەڕ دروست دەبێت و بەهۆی هەڵکەنرانی زۆرەملێ لە وڵاتی خۆیان، کۆمەڵگەکانی دیاسپۆرا بە گشتی ناسیونالیزمێک دروست دەکەن کە دەتوانین پێی بڵێین "ترانزناسیونالیزم".

## نەتەوە دیسینترالەکان

نەتەوەی کورد نەتەوەیەکە کە پێیخۆش نییە کوردستان بە جێبهێڵێت. ئەم پارادۆکسە لەوانەیە لە دیتنی یەکەمدا ئەو پرسیارە دروست بکات کە چۆن گەلی پەخش و بڵاوی کورد دەتوانێت نەتەوەیەک پێکبهێنێت؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە من سەرەتا ئەو هۆکارانە دەخەمە بەرباس کە کۆمەڵگەیەکی دیاسپۆرایی دروست دەکەن.

## پێکهاتنی ترانزناسیونالیزم

مارتین ڤان بروینسێن دەڵێت: "نەوەی دووەم واتا منداڵانی ئەو کرێکارە کۆچبەرانەی کە لە ئەورووپا گەورە بوون، زیاتر لە باوک و دایکەکانیان حەزیان لە شوناسی کورد و سیاسەتەکانی کوردە."

ئەم بانگەشەیە لەوانەیە لە دیتنی یەکەمدا وەک شتێکی نامومکین سەیر بکرێت. ئایا ئەو کەسانەی کە لە ئەڵمانیا گەورە بوون و بە زمانی

ئەڵمانی قسە دەکەن و لە کولتووری ئەڵمانیادا بەشداری دەکەن لەو کەسانە کوردترن کە لە وڵاتی کوردستاندا گەورە بوون؟

من پێموایە هۆکاری ئەوەی بۆ نەوەی دووەمی کەسانی دوور لە وڵات لە دایک و باوکەکانیان ناسیونالیستترن سێ شتە و لە ڕاستیدا هەر ئەم هۆکارانەیە کە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە کە بۆ "ترانزناسیونالیزم" دروست دەبێت و دەمێنێتەوە: هۆکاری یەکەم ئەوەیە کە دژواربوونی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتری ئینتیگراسیۆن لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا وایکردووە کە دوور لە وڵاتان کەمتر حەزیان لەوە بێت کە بە تەواوی یان تەنانەت بە شێوەی کەم تاکوت لە وڵاتانی نوێی خۆیان ئینتیگراسیۆن بن. ئینتیگراسیۆن لە ڕاستیدا شتێکی زۆر دژوار نییە، مەگەر ئەوە کە وەک شتێکی دژوار یا نەخوازراو سەیر بکرێت، بۆ نموونە ئەم کەسانە دەڵێن: "ئەوان (هاووڵاتیانی وڵاتانی بیانی- وەرگێڕ) نایانەوێت ئێمە قبوڵ بکەن". ئەم قسەیە تەنهاو تەنها بەهانەیەکە بۆ ئەو کەسە دوور لە وڵاتانەی کە نایانەوێت ئینتیگراسیۆن بن. کەسی دوور لە وڵات کەوتووەتە ناو کۆمەڵگەیەک کە ئەوی ناوێت کە ئەمەش لە قۆناغی یەکەمدا وایلێدەکات نەتەوەی نوێی خانەخوێی خۆی ڕەتبکاتەوە و بە شوێن شوێنێکی دیکەدا بگەڕێت تا قبوڵی بکات، واتا وڵاتی خۆی کە لێی دوور کەوتووەتەوە. ئەوە دوور لە وڵاتەکان زیاتر لە (دایک و باوکەکانیان) پێیان خۆشە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان بە چەند هۆکار: نەوەی دووەمی دوور لە وڵات بەتەواوی ئاگای لە بارودۆخی خۆی و"ئەوانی دیکە"هەیە و ئەو هەڵاواردنە دەبینێت کە دایک و باوکی هەم لە دوورە وڵاتی و هەم لە ناو وڵاتدا لەگەڵی ڕووبەڕوویە و وای بۆدەچێت کە دروستبوونی دەوڵەتێک بۆ نەتەوەکەی،

هەموو ئەو هەڵاواردن و کێشانە لادەبات کە خۆی و دایک و باوکی لە گەڵیاندا ڕووبەڕوون. لەمەزیاتر ئەو کەسە بە درێژایی گەورەبوونی، کۆمەڵێک دەنگوباسی لە وڵاتی خۆی پێگەیشتووە و ئەمەش هۆشیاری ئەتنیکی تێدا پەرەپێداوە، لە ئەنجامدا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت بە ناسیونالیست و ئەو هیوایەی تێدا دروست دەبێت کە لەوانەیە ڕۆژێ لە ڕۆژان بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی. بە بۆچوونی من خولیای گەڕانەوە بۆ وڵات لە قۆناغی یەکەمدا تەنها خەیاڵە و پێویست ناکات کوردی دوور لە وڵات بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، بەڵکو تەنها پێویستە ئەوە بزانێت کە دامەزرانی کوردستانێکی سەربەخۆ بە قازانجی گەلی کوردە.

هۆکاری دووەمی بوونی ترانزناسیونالیزم، لە ڕاستیدا هەمان هۆکاری بوونی ناسیونالیزمەکەیە. نەتەوەیەک کە بیەوێت لە کاریگەرییە پەخش و بڵاوکەرەکانی دوورەوڵاتی ڕزگاری بێت، دەبێت سەرنج بە "سەرچاوە بنەڕەتییە "هاوبەشەکانی خۆی بدات. ئانتۆنی ئیسمیت[٩٤] ئاماژە بە سێ سەرچاوە دەکات کە دەتوانین بە یەکێکیان ڕێژەی بەهێزبوونی ناسیونالیزم هەڵبسەنگێنین. ئێمە دەتوانین لەهەمان ئەو سێ سەرچاوەیە کەڵک وەربگرین بۆ ئەوەی ڕێژەی توانایی مانەوەی نەتەوەیەک هەڵبسەنگێنین، تەنانەت ئەگەر ئەو نەتەوەیە لە سەراسەری جیهاندا بڵاو بووبێت. ئەم سەرچاوانە بریتین لە: ١- بیرەوەری بە کۆمەڵ و بە تایبەت بوونی "قۆناغێکی زێڕین" (لە مێژووی ئەو نەتەوەیەدا - وەرگێڕ) ٢- بیروباوەڕی ئایینی و بوونی چەمکێک کە بە گوێرەی ئەو کۆمەڵگەیە لە کۆمەڵە "خەڵکێکی هەڵبژێردراو"پێکدێت ٣- بوونی وڵاتێکی باوباپیرانی.

---

Anthony Smith-[94]

بە نیسبەت کۆمەڵگەی دیاسپۆرا، وڵاتی باوباپیران دوور کەوتووەتەوە، کەوابوو ئەفسانەی نەتەوە بەهێز دەبێت و وەک خاڵێکی سەرەکی و بنەڕەتی بەکار دێت تا کۆمەڵگە پێکەوە ڕابگرێت. لەمەزیاتر هەروەها کە جۆشوا کالدۆر رابینسۆن[95] ئاماژەی پێدەکات، دیاسپۆراکان دەتوانن بە شێوەگەلی جۆراوجۆر خۆیان تیوەگلێننە ناو نەتەوە. کۆمەڵگە دیاسپۆراییەکان دەتوانن" ئەفسانەی نەتەوە"دروست بکەن و لە ڕێگای سەرپێچیکردن لە ئینتیگراسیۆن، لەسەر هەتاهەتاییبوونی نەتەوە پێداگری بکەن و نەریت بۆ خۆیان دروست بکەن. خاڵی لەوە گرنگتر ئەوەیە کە کۆمەڵگە دیاسپۆراکان دەتوانن کاریگەری لەسەر بۆچوون و کردەوەکانی ناسیونالیستەکانی ناوخۆی وڵاتی خۆیان دابنێن.

سەرەنجام ئەوە کە تەکنۆلۆژیا کەرەستەیەکە کە ناسیونالیزمی دیاسپۆرا بەرەو پێشدەبات. ئەو شتانەی کە باسکرا هۆکارەکانی بوونی ترانزناسیونالیزم بوون، بەڵام تەکنۆلۆژی هۆکاری چۆنییەتی بوونی ترانزناسیونالیزمە. پەیوەندییە خێرا جیهانییەکان ئەوەندە بەرفراوانە کە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئەو بوارەی ڕەخساندووە کە کۆمەڵگەکان پێکەوە پەیوەندییان هەبێت و دەتوانن پەیوەندییان هەبێت. چاپەمەنییەکان پەیوەندییەکانی نێو کۆمەڵگەکان سەرلەنوێ شکڵ پێدەدەن، بەڵام ڕادیۆ، تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت بە تەواوی پەیوەندییەکانی تۆڕە زانیارییەخشەکان بەهێزتر دەکەن.

جگە لە سەرلەنوێ شکڵپێدانەوەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، تەکنۆلۆژی بە شێوەگەلی دیکەش ترانزناسیونالیزم بەهێز دەکات. بە لەبەرچاو گرتنی

---

Robinson Joshua Kaldor-[95]

ئەوەی گەلی کورد قەد دەوڵەتی خۆی نەبووە، زمانی ستانداردی کوردی قەد دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخساوە پێشبکەوێت. لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەی وێبسایتە کوردییەکان بە خێرایی گەشەی کردووە و هەموو شتێک، لە وتارگەلی ڕۆژنامەنووسی و توێژینەوەوە بگرە تا مۆسیقای کوردی، پڕوپاگەندای سیاسی، دەنگوباس و کتێبە قەدەغەکراوەکان ئێستا لە ئینتەرنێتدا بڵاو دەبێتەوە و هەموو کەسێک دەتوانێت کەڵکی لێ وەربگرێت. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە بڵاوبوونەوەی نووسینی کوردی لە ئینتەرنێت لەوانەیە ببێتە هۆی ستانداردبوونی زمانی کوردی. کەوابوو لەم ڕێگایەوە تەکنۆلۆژی زۆربەی لایەنەکانی بزوتنەوەی ناسیونالیستی کوردی دیسینترالیزە٥ کردووە. ناسیونالیزم ئیدی مەحەلی نییە و بە تایبەت ئینتەرنێت دەرفەتی ئەوەی بۆ هەمووان ڕەخساندووە تا بێ گوێدان بە دووربوونی شوێنی ژیانیان، بەشداری تێدا بکەن.

## کاریگەرییەکانی دیاسپۆرا

تا ئێستا بیروبۆچوونەکانی پێکهاتنی دیاسپۆرامان خستەڕوو واتا ئەوەی کە بۆ کۆمەڵگە دیاسپۆراکان دروست دەبن و چۆن دەتوانن خاوەن کاریگەرییەکی ئەوەندە بەهێز بن. لەم بەشەدا کاریگەرییەکانی ناسیونالیزم لە دیاسپۆرا بە لێکدانەوەی نموونەی کورد دەخەینەڕوو:

## کاریگەری دانان لەسەر وڵاتی باوباپیران

بە لەبەرچاو گرتنی ڕێژەی باڵای پەیوەندییە ناوخۆییەکان لە جیهاندا، جێگای سەرسوڕمان نییە کە کۆمەڵگە دیاسپۆراکان کاریگەرییەکی یەکجار

زۆریان لەسەر ئاخێو و سیاسەتەکانی وڵاتی باوباپیرانی خۆیان هەیە. ئەم مەسەلەیە بە تایبەت بۆ دیاسپۆرای کورد وەڕاست دەگەڕێت. کوردەکانی دیاسپۆرا لە ئاخێوی نەتەوەییدا لە ڕێگای تەکنۆلۆژییەوە بەشداری دەکەن. ئەم کوردانە بیروبۆچوونەکانی خۆیان و تەنانەت شۆوە ڕادیۆییە ئینتەرنێتییەکان لە ماڵپەڕەکاندا بڵاو دەکەنەوە. ئەم کوردانە یارمەتی بە ئاخێوی ناسیونالیستی دەدەن و دەورێکی زۆر گرنگ لەم کایە چارەنووسسازەدا دەگێڕن. کۆمەڵگە دیاسپۆراییەکان لەگەڵ ئەو مەترسیانە ڕووبەڕوو نین کە کۆمەڵگەی ناوخۆی وڵات لە گەڵیدا ڕووبەڕوویە، کەوابوو ئەم دوو گروپە ئەجیندای جیاواز پێش دەخەن.

جۆل دیمیریز[96] ئاماژە بەوە دەکات کە گروپەکانی ناوخۆی وڵات لەگەڵ مەترسی برسێتی، ترسان و تۆقان و ئێش و گوشار ڕووبەڕوون، چونکە بە شێوەی فیزیکی کەوتوونەتە ناو (کێشەکە). لەگەڵ ئەمەشدا گروپە دیاسپۆراییەکانیش لەوانەیە هەست بە توڕەیی، بێ هیوایی یا نامۆیی بکەن. ئەم جیاوازییە کاریگەری لەسەر هەڵوێستەکانی هەردوو گروپەکە دادەنێت، کەوابوو ئامانجەکانی ئەم دوو گروپە لە یەک جیاوازن، بەڵام بەهۆی ڕێژەی باڵای پەیوەندییەکانیان، پێکەوە دەگونجێن. کەوابوو بەمشێوەیە کۆمەڵگەی ناوخۆی وڵات لە لایەن کۆمەڵگەی دیاسپۆراوە بەهێز دەبێت. لەوەش زیاتر، بۆ مرۆڤ ئاسانترە کە پاڵ بە ئایدیالە توندئاژۆکاندا بنێت ئەگەر ئاسایشی ئەو مرۆڤە لەژێر گوشاردا نەبێت و بەهۆی ئەوەی کە کۆمەڵگەی دیاسپۆرا لەگەڵ مەترسی ڕاستەوخۆ

Jolle Demmers-[96]

ڕووبەڕوو نییە، لەگەڵ ئەنجامی کردەوەکانی یا لەگەڵ توندوتیژی یا دژکردەوەی دەستبەجێ ڕووبەڕوو نابێتەوە.

ئاکامەکانی پێشکەوتنی ناسیونالیزمی دوورە وڵات، لە شێوەی هەڵسوکەوتی وڵاتانی بیانی لەگەڵ دیاسپۆرا هەست پێدەکرێت.

## کاریگەری دیاسپۆرا لەسەر ئەو وڵاتانەی کە تێیدا دەژین

جگە لە کاریگەری دانان لەسەر سیاسەتەکانی ناوخۆی وڵاتی خۆیان، کۆمەڵگە دیاسپۆراکان لەسەر سیاسەتەکانی ئەو وڵاتانەشدا کە تێیدا دەژین کاریگەری دادەنێن. بۆ شیکردنەوەی ئەم بابەتە من باسی دیاسپۆرای کورد لە ئەڵمانیا دەکەم.

لە ئاکامی ڕێککەوتننامەیەکی دوو لایەنەی نێوان ئەڵمانیا و تورکیا لە ١٩٦١، یەکەم شەپۆلی بەرفراوانی کۆچی کوردەکان بەرەو ئەڵمانیا دەستی پێکرد. لە کاتێکدا کە زەحمەتە بەراوردی ئەوە بکەین کە بەڕاستی چەندە کورد لە ئەڵمانیا دەژین، بەڵام لیون و ئوکارێر[٩٧] دەڵێن نزیکەی ٥٠٠ هەزار کورد لە ئەڵمانیادا هەیە. "پارتیا کارکەرێن کوردستان (PKK)"لە سەرەتای دەیەی ١٩٨٠وە دەستی کرد بە ڕێکخستن لە ناو ئەڵمانیا و بزوتنەوەیەکی جیاییخوازی کوردی هێنایە ناو ئەڵمانیا. لە سەرەتای دەیەی ١٩٨٠ تا ١٩٩٣ PKKلە ڕێگای هێنانی هەموو نموونەکانی، کێشەکەی خۆی لەگەڵ تورکیا بۆ ناو خاکی ئەڵمانیا کاریگەری لەسەر ئاخێوی ئەڵمانیا دانا بۆ ئەوەی سەرنجی کۆمەڵگەی ئەڵمانیا بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت PKK .

---

Lyon and Ucarer-[97]

مانگرتن و خۆپیشاندانی زۆر گەورەی بە ڕێکخستن دەکرد و تەنانەت ڕێگا سەرەکییەکانی دادەخست.

دیاسپۆرای کورد لە ئەڵمانیا نیشانیدەدات کە چۆن کۆمەڵگەی دیاسپۆرا دەتوانێت کاریگەری لەسەر نەتەوەی خانەخوێی خۆی دابنێت: یەکەم هۆکاری ئەم کاریگەرییە ئەوەیە کە سیاسەتی نێونەتەوەیی ئەڵمانیا بەهۆی چالاکییەکانی کوردەکانی ئەڵمانیا ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. بەهەرحاڵ کوردەکانی ئەڵمانیا کاریگەری باشیان لەسەر سیاسەتەکانی جیهان داناوە و بوونەتە یەکێ لە ئەڵقەکانی زنجیرە پەیوەندییەکانی نێوان ئەڵمانیا و تورکیا.

یەکێ لە ئامانجە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە دیاسپۆراکان ئەوەیە کە کاریگەری لەسەر (سیاسەتەکانی- وەرگێڕ) ئەو وڵاتە دابنێن کە تێیدا دژین، بۆ نموونە جولەکەکانی ئەمریکا لە سەرەتای سەدەی ٢٠ گوشاریان خستە سەر دەوڵەتی ئەمریکا تا پشتیوانی لە دەوڵەتی سەربەخۆی جولەکەکان بکات. گروپە دیاسپۆراکان لە ڕێگای بەدەستهێنانی هاوخەمی نەتەوەکانی دیکە، دەتوانن کاریگەری لەسەر سیاسەتەکانی دەوڵەتانی خانەخوێی خۆیان دابنێن.

## ئەنجام

بە لێکدانەوەی شێوەی پێکهاتن و کاریگەرییەکانی دیاسپۆرای ئێستای کورد، سەرەتا نیشانماندا کە چۆن بارودۆخ دەبێتە هۆی دروستبوونی دیاسپۆرا. بەهۆی سیاسەتەکانی نەتەوەسازی ئەو دەوڵەتانە کە وڵاتی باوباپیرانی گەلی کوردیان خستووەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، گەلی کورد لە سەراسەری جیهاندا بڵاو بووەتەوە. من پێموایە کە کۆمەڵگە دیاسپۆراکان ئەنجامی ناسیونالیزمی جۆراوجۆرن. جگە لەوەش دەوڵەت نەتەوەسازی زۆربەی جاران پەیوەندی بە لەناوبردنی کەمینە نەتەوەییەکانەوە هەیە.

لە کاتێکدا کە کردەوەکانی نەتەوەسازی دەوڵەتەکان، بووەتە هۆی بڵاوبوونەوەی خەڵک لە سەراسەری جیهاندا، بەڵام بڵاوبوونەوەی تەنها یەک ئەتنێک بەس نییە بۆ دروستبوونی کۆمەڵگەی دیاسپۆرا. بە بۆچوونی من، خەڵکی دوورەوڵات دەبێ بگەنە ئەو قەناعەتە کە ناتوانن لە ناو ئەو وڵاتانەی کە تێیدا دەژین، ئینتیگراسیۆن بن.

خاڵی دووەم ئەوەیە کە سەرچاوە قووڵەکانی ئەتنیکی گەلانی دوورە وڵات، ئەڵقەیەکی پەیوەندی لە نێوان دوور لە وڵاتان دروست دەکات و ئارەزووی ئەوەی ببن بە خاوەنی وڵاتێک، بەرەو ترانزناسیونالیزم پاڵیان پێوەدەنێت. خاڵی کۆتایی ئەوەیە کە تەکنۆلۆژی ڕێگا بە گەلانی پەخش و بڵاو دەدات تا کۆمەڵگەیەکی دیاسپۆرا دروستبکەن. بە کەڵکوەرگرتن لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیان، خەڵکی پەخش و بڵاو دەتوانن یەکدی بدۆزنەوە

و یەکبگرن. بۆ پەیوەندیی کە لە ڕێگای ئامرازە نوێکانەوە دروست دەبێت گروپە دیاسپۆراکان زۆربەی هێزی خۆیان لە دەستدەدەن.

سەرهەڵدانی گروپە دیاسپۆراکان شێوەی کاری ناسیونالیزمی سەرلەنوێ شکڵ پێداوە. دەوڵەت نەتەوەکان هێشتا نەمردوون، بەڵام ئیدی تەنها ئەکتەرانی سیاسەتە نێونەتەوەییەکان نین. بەهۆی ئەوەی خەڵک ڕۆژبەڕۆژ زیاتر چالاک دەبن، ناسیونالیزمی دوور لە وڵاتیش ڕۆژبەڕۆژ بەهێزتر دەبێت، کەوابوو لە کاتی توێژینەوە دەربارەی ناسیونالیزم، ئیدی ناکرێت ترانزناسیونالیزم پشتگوێ بخرێت.

## سەرچاوەکان:

[1] Wu, Fang, Huberman, Bernardo A., Adamic, Lada A. and Joshua R. Tyler, 2004, Information Flow in Social Groups, PhysicaA, Vol. 337, pp 327-335.

2] Anderson, Benedict, 1991, Imagined Communities, Verso, London and New York, pp
4-46.

[3] Anderson, Benedict, 1992, Long-Distance Nationalism: world capitalism and the rise of identity politics, The Wertheim Lecture 1992, Centre for Asian Studies, University of
Amsterdam, pp 1-14.

[4] Bruinessen, Martin van, 2000, Transnational aspects of the Kurdish question, Working
paper, Robert Schuman Centre for Advanced Studies, European University Institute,
Florence.

[5] Demmers, Jolle, 2002, Diaspora and Con ict: lo cality, long-distance nationalism and the delo calisation of con ict dynamics, The Public/Javnost Vol. 9, no. 1

[6] Gellner, Ernest, 1997, Nationalism, Phoenix, London, pp 1-36.

[7] Kaldor-Robinson, Joshua, 2002, The Virtual and the Imaginary: The Role of Diasphoric New Media in the Construction of a National Identity during the Break-up of
Yugoslavia, Oxford Development Studies, Vol. 30, No. 2, 2002, pp 177-187.

[8] Kempe, David, Kleinberg, Jon, and Demers, Alan, 2001, Spatial gossip and resource
lo cation protocols, Proceedings of the 33rd ACM Symposium on Theory of Computing,
2001.

[9] Kymlicka, Will and Christine Straehle, 2000, Cosmopolitanism, Nation-States and Minority Nationalism: A Critical Review of Recent Literature, European Journal of
Philosophy 7:1, pp 65-88.

[10] Lyon, Alynna J. and Emek M. Ucarer, 1998, The Transnational Mobilization of Ethnic Conflict: Kurdish Separatism in Germany. Paper presented at the International
Studies Association annual meeting, Minneapolis, Minnesota, March 1998.

[11] Wahlbeck, Osten, 1998, Transnationalism and diasporas: the Kurdish example presented at the International Sociological Asso ciations XIV World Congress of
Sociology, Montreal, Canada, July 1998.

[12] Smith, Anthony D., 1996, "The Resurgence of Nationalism? Myth and Memory in the Renewal of Nations", The British Journal of Sociology, Vol. 47, No.4, pp 575-598.

[13] Wasserman, Stanley and Faust, Katerine, 1994, Social Network Analysis, Cambridge, U.K.

# کاریگەری ئیسلام لەسەر دروستبوونی ناسیونالیزمی کورد

هاکان ئۆزئۆغلو

ئەم وتارە کاریگەری ئیسلام لەسەر دروستبوونی شوناسی کورد شیدەکاتەوە. ئەم شیکردنەوەیە لە سەدەی ٧ دەستپێدەکات (کاتێک کە کوردەکان چوونە سەر ئایینی ئیسلام) و لە سەدەی ٢٠ کۆتایی پێدێت، واتا ئەو کاتە کە ناسیونالیزمی کورد لە پێناو شوناسی کوردیدا بوژایەوە. بەهەرحاڵ قوڵایی ئەم کاریگەرییە لە قۆناغێک بۆ قۆناغێکی دیکە جیاوازە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستدان، رێگای ئەوەمان پێنادات ژیانی ئاسایی خەڵکی پێ شیبکەینەوە، ئەم وتارە زۆرتر لەسەر هەندێ قۆناغی زەمەنی تایبەت و لەسەر کەسایەتییە کوردەکان کە ژیان و رابردوویان دەتوانێت رۆشنایی بخاتە سەر ئەم بابەتەی خۆمان، چڕ بووەتەوە. بۆ باسکردنی دەوری ئیسلام لە شوناسی کورددا سەرەتا دەمەوێت سەرنجی خوێنەران بەرەو لای بیرۆکەکانی خۆم رابکێشم.

من دەمەوێت لەم وتارەدا ئەوە بڵێم کە شوناسی کورد مەنگ و وشک نییە و چەند قۆناغی جۆراوجۆری بەرەوپێشچوونی بەسەرهاتووە: ئەم قۆناغانە دیالیکتیکاڵ، دیالۆجیکاڵ و مۆنۆلۆجیکاڵن. هەروەها لەم وتارەدا زیاتر باسی ئەوە دەکەین کە لە هەمووی ئەم قۆناغانەدا، وێنای گشتی ئەوەیە کە شوناسی کورد بەهۆی پەیوەندی لەگەڵ هێزێکی دەرەکی پێشکەوتووە. لە شوێنێکی دیکەدا من پەیوەندییە ناوخۆییەکانی نێوان شوناسی کورد و دەوڵەتە بەهێزەکانی دەوروبەریانم باس کردووە (١). لەم وتارەشدا من هەمان ئەو مەسەلەیە تا ئەو شوێنە کە پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەیە، دەخەمە بەرباس.

کاریگەری دیالیکتیکاڵی ئەو ڕەوتەیە کە تێیدا شوناسە محەللییەکان لەگەڵ ئیسلامدا لەیەک دەدەن و دەبنە سەنتیزێک و هەنگاوێک بەرەوپێش لە گەشەی شوناسی کورددا پێکدەهێنن. بەهەرحاڵ لێکدادانێکی وەها دەکرێت وەک لێکدادانی دوو ئیدوئولۆژیی ڕکابەر (ئیسلام و ناسیونالیزم لەم وتارەدا)سەیر بکرێت کە هەردووکیان پێویستیان بە وەفاداری سیاسی پەیڕەوانەکانیان هەیە (٢). لە ئەنجامی لێکدادانی نێوان ئەم دوو شوناسە ڕکابەرەدا سەنتیزێکی ئیدوئۆلۆژیکی دروستدەبێت. ئەم سەنتیزە کە ئیسلام و ناسیونالیزمی تیکەڵ کردووە لە لایەن کوردەکانەوە وەرگیراوە. ئەم سەنتیزە تایبەتە لە قۆناغی نوێدا لە ناو ئەو کوردانەی کە ڕابردووی ئیسلامی بەرجەستەتریان هەیە، بەدیدەکرێت.

لە لایەکی دیکەوە کارو کاریگەری دیالۆجیکاڵ دەبێ زۆرتر وەک پەیوەندی سەیر بکرێت تا پێکدادان. هەندێجار جیاوازی نێوان کاریگەری دیالۆجیکی و دیالێکتیکی جێگای ناکۆکییە. ڕەوتی مۆنۆلۆجیکاڵ شتێکی

زۆر جیاوازە. لەم قۆناغەدا ئیسلام شوناسێکی تایبەت بەسەر گروپدا دەسەپێنێت و کاریگەری دوو لایەنە لە کەمترین ئاستی خۆیدایە. من لەم وتارەدا ئەو هەڵێنجاندنە دەخەمەڕوو کە شوناسی کورد لە قۆناغگەلی جۆراوجۆری ڕەوتی دیالیکتیکاڵ، دیالۆجیکاڵ و مۆنۆلۆجیکاڵ لە پەیوەندییەکەی لەگەڵ ئیسلامدا تێپەڕیوە.

پێش هەموو شتێک دەبێ بڵێم کە توێژینەوە لەسەر گروپە ئەتنیکییەکان بۆ مێژوونووسان کێشەیەکی جیددییە (٣). توێژینەوەیەکی وەها لەسەر ئەو وێنایە چڕ دەبێتەوە کە گروپە ئەتنیکییەکان، یەکینەگەلێکی پێناسەکراوی مێژوویی و کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن کە دەکرێت بەو زانیارییانە کە لە سەرچاوە مێژووییە لەبەردەستەکاندا تۆمار کراون، تاوتوێ بکرێت. لە ڕاستیدا مێژوونووسان لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بە کۆمەڵێک قیاس (ئیستینتاج)ی مەنتیقی دەستپێدەکەن و کۆتایی پێدێنن. ئەم ئیستینتاجانە زۆرتر بۆ یارمەتیدان بە سەلماندنی هەڵێنجاندنەکانی نێو پۆلێنەکان بەکار دێت (کە پشتی بە بەڵگەیەکی متمانەپێکراو بەستووە) کە لە دەستڕەسی مێژوونووسدا نییە.

لە پەیوەندی لەگەڵ توێژینەوە دەربارەی کوردەکان وەک یەکینەیەکی شیکاری، ئەم کێشەیە زۆر بەدیدەکرێت، چونکە مێژوونووس ناچارە کوردەکان وەکو یەکینەیەکی یەکگرتوو سەیر بکات، واتا یەکینەیەک کە لە سەراسەری مێژوودا هەبووە، هەرچەند کە ئەم بوونە بەشێوەیەکی نەگۆڕ نەبووە. لەگەڵ ئەمەشدا لە ڕاستیدا زانیاری پێویست بۆ پێناسەکردنی فاکتۆرەکانی کۆمەڵگەی کورد لە سەرچاوە تۆمارکراوە مێژووییەکاندا زۆر زۆر کەمە. فاکتۆرە لەبەردەستەکان نیشاندەدات کە دەستەواژەی "کورد"

بەرچەسپێکی دەرەکی بووەو خودی کوردەکان ئەم دەستەواژەیان وەک شوناسی سەرەکی خۆیان تەنها لەم دواییانە و لە ئەنجامی سەرهەڵدانی دیاردەی ناسیونالیزمدا بەکارهێناوە. ئەڵبەتە ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە کوردەکان ئاگایان لەم دەستەواژەیە پێش لە سەدەی ۲۰ نەبووە، چونکە هەندێ لە کوردەکان ئاگایان لێیبووە و لە سەرەتای سەدەی ۱٦ دەستیان کردووە بە نووسینی بەرهەمی ئەدەبی تایبەت بە کۆمەڵگەی کورد. بە هەرحاڵ هیچ ئامارێک لە بەردەستدا نییە کە ژمارەی ئەم کوردانە چەندە بووە.

کەوابوو کێشەکە ئەوەیە کە چۆن دەستەواژەی "کۆمەڵگەی کورد" لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێستای ئێمەدا پێناسە بکرێت. من کۆمەڵگەی کورد لە چوارچێوەی دەستەواژەگەلێکی بەرفراوانتردا پێناسە دەکەم. لەم لێکۆڵینەوەیەی بەردەستماندا کۆمەڵگەی کورد وەک ئاماژەیەک بە گروپێک لە خەڵک کە خۆیان وەکو کورد پێناسە کردووە یا لە لایەن لایەنە دەرەکییەکانەوە وەکو کورد پێناسە کراون، بەکار براوە. بەهەرحاڵ خوێنەر دەبێت ئاگادار بێت کە پێناسەی کورد لە سەدەیەک بۆ سەدەیەکی دیکە و لە کەسێک بۆ کەسێکی دیکە جیاواز بووە.

پێش ئەوەی من ئەو کاروکاریگەرییە دیالیکتیکاڵ، دیالۆجیکاڵ و مۆنۆلۆجیکاڵانە بخەمە بەر باس کە شوناسی نوێی کوردیان پێکهێناوە، با بە کورتی چاوێک بە چۆنییەتی بە موسڵمانبوونی کوردەکاندا بخشێنین.

## کورد چۆن بوو بە موسڵمان

زانیاری باوەڕپێکراو (ئەڵبەتە ناتەواو) دەربارەی بە موسڵمانبوونی کوردەکان لە سەرچاوەکانی سەرەتای ئیسلامدا هەیە. نووسەرە عەرەبەکان لە کاتی باسکردنی فتووحاتی سەرەتای ئیسلامدا ئاماژەیان بە هەندێ گرووپی عەشیرەتی کردووە و زۆر بە کورتی ناوی "کورد"یان هێناوە. زانیاری زۆر تەنانەت دەربارەی ئەوەی کە ئەم نووسەرە عەرەبانە مەبەستیان لە دەستەواژەی"کورد" ( کە کۆکەی دەبێت بە الاکراد) چی بووە، لە دەستدا نییە. بە هەرحاڵ ئەم سەرچاوانە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە کوردەکان بە کەیفی خۆیان نەبوون بە موسڵمان، چونکە کاتێک کە سوپای عەرەب لە سەدەی یەکەمی ئیسلامیدا میزۆپۆتامیایان داگیر کرد، عەشیرەتە بەناو کوردەکان لە بەرامبەر داگیرکاری عەرەب ڕاوەستان و لە ئاکامدا یا دەکوژران، یا ناچار دەبوون "جزیە" (باجێک کە ناموسڵمانان بە موسڵمانەکانیان دەدا) بدەن.

بۆ نموونە عزالدین ابن الاسیر[98] (١١٦٠-١٢٣٣) بەسەرهاتێکمان دەربارەی فەرماندەیەکی عەرەب بە ناوی سلام بن قیس الاشجعی[99] و هەوڵەکانی بۆ بە موسڵمانکردنی عەشیرەتێکی کورد بۆ دەگێڕێتەوە. لە بەشێک لەژێر ناوی "چیرۆکی سلام ابن القیس الاشجعی و کوردەکاندا"، ابن الاسیر دەڵێت: "سوپای سلام بن قیس ڕۆیشتن و ڕۆیشتن تا تووشی کوردە دوژمنەکان بوون کە باوەڕیان بە ئیسلام نەبوو. سوپای قیس

---

98- Izzaldin Ibn Alathir

99- Salama Ibn Alqays Alesjai

داوایان لە کوردەکان کرد یا ببن بە موسڵمان یا جزیە بدەن. بەڵام کوردەکان قبوڵیان نەکرد، هەربۆیە سوپای ئیسلام لەگەڵ کوردەکان شەڕی کرد و هەرەسی پێهێنان و شەڕوانە کوردەکانی کوشت و منداڵە کوردەکانی بەدیلی برد" (٤).

عزالدین ابن الاسیر مێژوونووسێکی بەناوبانگی عەرەب بوو کە لە موسڵ و بەغداد دەژیا و کتێبەکەی بە ناوی "الکامل فی التاریخ"[١٠٠] باسی مێژووی جیهان لە کاتی دروستبوونی "ئادەم"ـەوە دەکات. هەندێ لە بەشە تایبەتەکانی ئەم کتێبە باسی فتووحاتی ئیسلام دەکات. ئەو بەسەرهاتە کە باسمانکرد، لە ساڵی ٦٤٤ی زایینی، واتا دوایین ساڵی دەسەڵاتداری خەلیفەی دووەم، عومەر ڕوویداوە. ئەم بەسەرهاتە بە دڵنیاییەوە نیشانیدەدات کە لانیکەم گروپێک لە کوردەکان قەد ئیسلامیان نەهێناوە و پێیان باشتر بووە بکوژرێن تا ئەوە کە ئیسلام بهێنن.

کتێبەکەی عزالدین ابن الاسیر لەوانەیە نەکرێت وەک سەرچاوەیەکی تەواو بۆ چۆنییەتی بە موسڵمانبوونی کوردەکان دابنرێت، چونکە زیاتر لە ٥ سەدە پاش ئەو ڕووداوە تایبەتە نووسراوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت لەبیرمان بێت کە نەریتی نووسینی مێژووی عەرەب لە سەردەمی عەباسییەکاندا (٧٥٠-١٢٥٨ی زایینی) بووژایەوەو گەشەی کرد. لەو کاتە بە دواوە سەرچاوەگەلێک کە ئاماژەیان بە فتووحاتی سەرەتای ئیسلامدا کردووە، دوو سەدە پاش ئەم ڕووداوە سەریهەڵدا. لەگەڵ ئەمەشدا ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە ئەم سەرچاوانە باوەڕپێنەکراون.

---

[100] Al-Kamil fi Al-Tarikg-

بۆ نموونە یەکێ لە نووسەرە سەرەتاییەکانی عەرەب کە بە تایبەت باسی فتووحاتی سەرەتای ئیسلامی لە سەدەی ٩ی زایینی کردووە، ابن جابر البلادهوری[101] (ساڵی ٨٢٩ی زایینی کۆچی دوایی کردووە)یە کە دیمەنگەلی ڕوون دەربارەی فتووحاتی سەرەتای ئیسلام دەخاتەڕوو کە لە چوارچێوەی زنجیرەیەک گواستنەوەی متمانەپێکراو وەک حەدیس پشتاوپشت هاتووە. بلادهوری لە کتێبەکەیدا بە ناوی" کتاب فتوحات البلدان"[102] کۆمەڵێک بەسەرهات وەک ئەوەی کتێبی"الکامل فی التاریخ"[103] دەربارەی شێوەی ئیسلامهێنانی کوردەکان دەنووسێت. بۆ نموونە لە بەشێکدا لەژێر ناوی "فتوحات المداین" بلادهوری دەڵێت: "فەرماندەی سوپای ئیسلام داوای لە کوردەکانی بەلاسەجان[104] کرد ئیسلام بهێنن، بەڵام کوردەکان شەڕیان لەگەڵ کرد و بن کەوتن. هەندێ لە کوردەکان ناچار کران باج و هەندێکی دیکە سەدەقە بە سوپای ئیسلام بدەن، بەڵام زۆرتر هەر باجەکە بوو(٥).

ئاماژەی بلادهوری بە فتووحاتی مەداین (شوێنێک لە نزیکی بەغدادی ئێستا) یەکێ لە نموونە سەرەتاییەکانە کە مرۆڤ دەتوانێت کۆمەڵێک زانیاری دەربارەی فەتحکردنی سەرزەمینە کوردەکان وەچەنگ بخات. لێرەشدا وەک نموونەی پێشووتر، بەرخۆدانی کوردەکان لە بەرامبەر سوپای داگیرکاری عەرەب بەدیدەکرێت. بەهەرحاڵ پاش بەرخۆدانییە

---

Ibn Jabir Al-Baladhuri-[101]

Kitab Futuh Al-Buldan -[102]

Al-Kamil fi Al-Tarikg-[103]

Balasajan-[104]

سەرەتاییەکان، کوردەکان بە کۆمەڵ هاتنە سەر ئایینی ئیسلام و ئێستاش شانازی بەوە دەکەن کە لە کۆمەڵگە یەکەمینەکان بوون کە ئەم ئایینەیان قبوڵ کردووە. لە سەدەکانی دواتردا کوردەکان بوون بە یەکێ لە گرنگترین کۆمەڵگەکانی "امە"ی ئیسلامی.

پێش ئەوەی زیاتر تاوتوێی قۆناغە زەمەنییەکانی دواتر بکەین، دەبێ ئاماژە بە دوو خاڵی گرنگ بکەین: یەکەم ئەوە کە لە بەرهەمەکانی سەرەتای ئیسلامدا واتای وشەی "کورد" قەد ڕوون نەبووە، کەوابوو ناتوانین ئەو شتانەی کە دەربارەی ئیسلامهێنانی کوردەکان وتمان، بیلکێنین بە هەموو کوردەکانەوە. خاڵی دووەم و گرنگتر ئەو پرسیارەیە کە بۆ بە ماوەی هەزار ساڵ کوردەکان نەیانتوانی ئەدەبیاتێکی تایبەت بە کۆمەڵگەی خۆیان بخوڵقێنن. هەتا سەدەی ١٦ ئێمە هیچ نووسراوێکمان نییە کە لە لایەن کوردێکەوە نووسرابێ و تێیدا باسی کورد و کۆمەڵگەی کوردی کردبێ، بەڵکو نەتەوەکانی دیکە وەک عەرەبەکان، فارسەکان و تورکەکان باسی کوردیان کردووە. تەنها پاش سەدەی ١٦ بوو کە کوردەکان هەندێک هۆگرییان بە تێپەڕبوون لەم شوناسە عەشیرەتییە نیشاندا و تەنها لە سەدەی ٢٠ (دوای سەرهەڵدانی دیاردەی ناسیونالیزم) بوو کە ئیتنیسیتەی کورد بە گشتی لەژێر سێبەری ئیسلام هاتە دەرەوە. دەبێ پرسیار بکرێت کە بۆ بە ماوەی ٩٠٠ ساڵ دەستەواژەی کورد تەنها بەرچەسپێک بوو کە تەنها لە لایەن بیانییەکانەوە بۆ وەسفکردنی گروپێک لە خەڵک کەڵکی لێ وەردەگیرا و ئەو خەڵکە کە وەکو "کورد" وەسف دەکران خۆیان لەم دەستەواژەیە کەڵکیان وەرنەدەگرت (٦).

پرسیاری دووەم ئەوەیە کە نووسەرانی سەرەتای ئیسلام مەبەستیان چی بوو کاتێک کە کەڵکیان لە وشەی "کورد"وەردەگرت؟ ئێمە بە دڵنیاییەوە نازانین مەبەستیان چی بووە، هەرچەند کە دەزانین عەرەبەکان ئەم دەستەواژەیان بۆ ئەو مەبەستە بەکار نەدەهێنا کە ئێستا بەکاری دەهێنن. توێژەران لەسەر ئەوە هاوڕان کە عەرەبەکان ئەم وشەیان بۆ گرووپێک لە ڕەوەندەکان کە لە ناو و دەوروبەری هەندێ ناوچەی شاخاوی تایبەت لە میزۆپۆتامیا دەژیان بەکاردەهێنا، کەوابوو دەتوانین تاڕادەیەک بە دڵنیاییەوە بڵێین کە وشەی "کورد" هەتا کۆتایی سەدەی ١٩ نەبووبوو بە ناوی ئەتنیکێک (بە ناوی کورد).

بۆ نموونە کوردناسی هۆڵەندی، مارتین ڤان بروینسن، باسی مەهدی بن مەیمون[١٠٥] دەکات کە زانایەکی موسڵمان بووە کە لە سەدەی ٨ لە بەسرە ژیاوە. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە سەرچاوەکان وەک کوڕی کورد باسی "مهدی بن مامون" دەکەن . مارتین ڤان بروینسن سەرنجی خوێنەر بەرەو لای ئەو خاڵە ڕادەکێشێت کە ئەم ناوە واتا باوکی مەیمون (نەک خودی مەیمون) وەک کورد وەسفدەکات (٧). ئەم بیرۆکەیەی ڤان بروینسن ئەو گریمانەیە بەهێز دەکات کە عەرەبەکان لە بنەڕەتدا وشەی "کورد"یان وەک ناوی ئەتنیکێک بەکار نەدەهێنا، بەڵکو لەوانەیە وەکو ناوی "عەشیرەتێکی ڕەوەندی نەخوێندەوار "بەکاریان هێنابێ.

بەهەرحاڵ سێ سەدە دواتر سەرچاوەکانی سەرەتای ئیسلام ئاماژەی تایبەت بە ابو یوسف یعقوب الکردی[١٠٦] (ساڵی ١٠٨٢ مردووە) دەکەن کە

---

Mahdi Ibn Maymun-[105]

Abu Yusuf Yaqub Al-Kurdi-[106]

زماننناس بووه. به وتەی مارتین ڤان بروینسن، الکردی یەکەم کوردێک بووه که ناوی له ناو چینی خوێندەواردا تۆمار کراوه (٨). ئەگەر ئەمە ڕاست بێت، هۆکارەکەی ئەوەیه کە له سەدەی ١١، دەستەواژەی کورد ئەندامێکی چینی "علما"ی نەخستووەتە دەرەوەی بازنەی خۆی. ئەمە شتێکی هەنگاو به هەنگاوه، بەڵام لەهەمان کاتدا لادانێکی گرنگە له واتای بنەڕەتی دەستەواژەی "کورد" کە مەبەستی زۆرتر چینێکی پێناسەکراو (واتا ڕەوەند) بووه نەک ئەتنیک(٩). ئەم نموونەیە نیشانیدەدات کە له سەدەی ١١، سنووری نێوان ئەم دووانە (چین و ئەتنیک) ڕوون نەبووه و تێپەڕبوون له چین بەرەو پێناسەیەکی نیمچە ئەتنیکی دەستی پێکردووه.

ماوەیەکی کورت پاش پەیوەندییه سەرەتاییەکانی کوردەکان لەگەڵ ئیسلام، شوناسی کورد بەتەواوی بەرەو لای ئیسلام ڕاکێشرا و ئەم ڕاکێشرانە ئەوەندە زۆر بوو کە خودی کوردەکان ئەسڵ و بنەچەی بنەماڵەی خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ پێغەمبەری ئیسلام یا نزیکترین سەحابە عەرەبەکانی پێغەمبەر. نموونەی هەره زەقی ئەم مەسەلەیە، گەورە پیاو و نووسەری کوردی سەدەی ١٦، شەرەفخان بیتلیسییە.

## شەرەفخان بیتلیسی و شەرەفنامە

له سەدەی ٧ تا سەدەی ١٦ هیچ سەرچاوەیەکی تۆمارکراو له بەردەستدا نییە کە نیشانیبدات خودی کوردەکان دەستەواژەی "کورد"یان بەکارهێنابێ بۆ ئەوەی کۆمەڵگەیەک یا سیاسەت یا شتێکی دیکەی یەکدەست نیشانبدەن. له سەدەی ١٦ واتا ٩٠٠ ساڵ دوای ئەوەی کە دەستەواژەی "کورد" بۆ یەکەمجار له لایەن عەرەبەکانەوە بەکار برا،

کوردێک کتێبێکی دەربارەی مێژووی سلسلە کوردەکان نووسی واتا "شەرەفنامە" کە شەرەفخان بە زمانی فارسی نووسی. "شەرەفنامە" بە یەکەمین سەرچاوە دادەنرێت کە کوردێک نووسیبێتی و کۆمەڵێک بەرچاوڕوونیمان پێبدات دەربارەی ئەوەی کە کورد ئەوکاتە چۆن سەیر کراوە. قەزاوەتی شەرەفخان بە هیچ شێوەیەک بۆ سەرجەم ئەو کەسانە وەڕاست ناگەڕێت کە ئەو پێیان دەڵێت "کورد"، بە پێچەوانەوە تەنانەت تا کۆتایی سەدەی ١٩ زۆربەی کوردەکان خۆیان وەک کورد پێناسە نەدەکرد بەڵکو پێناسەی عەشیرەتی خۆیان بە باشتر دەزانی. لەگەڵ ئەمەشدا "شەرەفنامە" هێشتا سەرچاوەیەکی زۆر باشە بۆ دۆزینەوەی شوێنپێی گەشەکردنی بەرەبەرەی شوناسی کورد.

شەرەفخان ساڵی ١٥٤٣ لە ئێران لە دایک بوو(١٠)، باوکی (شەمسەدینی سێیەم[١٠٧])حاکمی ناوچەی بتلیس و سەرۆکی عەشیرەتی روزەکی (ڕۆژەکی)[١٠٨] بوو. شەمسەدین قەڵەمڕەوی عوسمانی لە ساڵی ١٥٣٥ واتا پێش لەدایکبوونی شەرەفخان بە جێهێشت و چووە ئێران و لەوێ لەژێر ناوی" خان" خزمەتی دیوانی سەفەوی کرد.

سەرچاوەکان نیشانیدەدات کە هۆکاری سەرەکی ئەوەی کە بۆ شمس الدین ئاراستەی وەفاداری خۆی بەم شێوەیە گۆڕا، ئەوە بوو کە بیتلیس (کە قەزایەکی قەڵەمڕەوی عوسمانی بوو کە هەر لە کۆنەوە بنەماڵەی شمس الدین حاکمی بوون) کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی عولەما پاشا[١٠٩] کە

---

107- Şemseddin III

108- Ruzegi(Rujeki)

109- Ulema Pasha

فەرماندەیەکی عوسمانی و ڕکابەری شمس الدین بوو. شەرەفخان هەر وەکو باوکی، دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی گرنگی لە ناوچەکانی ئیمپراتۆری سەفەوی بەدەستهێنا، بۆ نموونە کاتێک کە شەرەفخان ١٢ ساڵان بوو، شاتەهماسبی سەفەوی (١٥٢٤-١٥٧٦) لەقەبی (نازناوی) "ئەمیری کوردەکان"ی پێبەخشی و سێ ساڵ هەر ئەم لەقەبەی هەبوو. پاش ئەوەی شا ئیسماعیلی دووەم لە ساڵی ١٥٧٦ بوو بە حاکمی ئیمپراتۆری سەفەوی، شەرەفخان بە لەقەبی "امیر الامرا"ی کوردەکان بوو بە حاکمی نەخجەوان لە ئازەربایجان و شیروان. بە هەرحاڵ کاتێک کە ئیمپراتۆری عوسمانی تەنگی بە سەفەوییەکان هەڵچنی و بەهۆی ئەوەی دوژمنایەتیکردنی ڕکابەرەکەی شەرەفخان لە دیوانی سەفەوی زیاتر بوو، شەرەفخان پێشنیاری خزمەتکردنی کرد بە سوڵتان موڕادی سێیەمی عوسمانی و لە بەرامبەردا بوو بە حاکمی بیتلیس و نیوەی قەزای موش و وان. ساڵی ١٥٧٩ شەرەفخان دەسەڵاتەکەی تەسلیم بە کوڕەکەی خۆی بە ناوی شمس الدین کرد و خۆی سەرقاڵی نووسینی کتێبێک کرد کە بوو بە "شەرەفنامە" یا مێژووی سلسلەی کوردەکان.

شەرەفنامە زۆر گرنگە، چونکە یەکەم کتێبێکە کە کوردێک نووسیبیتی و هەمووی دەربارەی کورد بێت. بەهەرحاڵ گرنگی تایبەتی ئەم کتێبە بۆ ئەم توێژینەوەیەی ئێمە لەوەدایە کە کاریگەری ئیسلام لەسەر شوناسی کورد نیشاندەدات. شەرەفخان باسی ڕەگوڕیشەی کوردەکان و ئەو ئەفسانانە دەکات کە دەربارەی کورد (زۆرتر بە زمانی عەرەبی و غەیرە عەرەبی) نووسراون(١١). شەرەفخان هەروەها کەڵکی لەو زانیاریانە وەرگرتووە کە خۆی لەو کەسانە کۆی کردووەتەوە کە لەم کتێبەدا ناوی

هێناون. شەرەفخان لەکاتی باسکردنی ڕەگوڕیشەی بنەماڵە گەورە کوردەکان ئاماژە بەوە دەکات کە خودی ئەم بنەماڵانە ڕەگو بنەچەی خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ سلسلە عەرەبە گەورەکان، وەک عەباسییەکان و ئەمەوییەکان. بۆ نموونە شەرەفخان پێمان دەڵێت: کە شەجەرەی حاکمەکانی حەکاری کە بە "شەنبو"[110] ناسراون، دەگەڕێتەوە بۆ خەلیفە عەباسییەکان (١٢). بەهەمان شێوە حاکمەکانی عیمادییە[111] بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕەگوڕیشەیان دەگەڕێتەوە بۆ عەباسییەکان (١٣)و حاکمەکانی "جزیرە"ش ڕەگوڕیشەی خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ فەرماندەیەکی ئەمەوی بە ناوی خالد بن ولید (١٤).

شەرەفنامە کۆمەڵێک زانیاریمان دەربارەی ڕەگوڕیشەی بنەماڵە گەورەکانی سەدەی ١٦ دەداتێ. هەرچەند کە لە سەدەی ٢١دا، گەڕاندنەوەی ڕەگوڕیشەی بنەماڵە کوردەکان بۆ سەر عەرەبەکان لە ناو ئاخێوی ناسیونالیستی کورددا جێگای مشتومڕە، بەڵام لە سەدەی ١٥ دا هەوڵێکی وەها هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ دەرکی شەرەفخان لە شوناسی کورد نەبووە.

لێرە پرسیارێکی گرنگ دێتە کایەوە ئەویش ئەوەیە کە بۆ بنەماڵە کوردەکان کە ئەوەندە بە گەرموگوڕییەوە دژی عەرەبە موسڵمانە داگیرکەرەکان لە سەدەی ٧دا شەڕیان کرد، بێ هیچ دوودڵییەک لە سەدەی ١٦ ڕەگوڕیشە و بنەچەی خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ سەر عەرەبەکان. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ ئیسلام وەک پرەنسیپێک

---

Şenbu-[110]

Imadiye-[111]

(نەک تەنها وەک هۆکارێک) سەیر بکرێت. شتێکی ڕوونە کە بنەماڵە کوردەکان ٩٠٠ ساڵ دوای ئەوەی ئیسلامیان هێنا، لە ئاستی محەلیدا خۆیان لەسەر بنەمای عەشیرەتەکەیان و لە ئاستی گشتیدا خۆیان وەک موسڵمان پێناسە دەکرد و دەستەواژەی "کورد"یان وەک نیشانەیەکی شوناسی خۆیان بەکار نەدەهێنا.

هەروەها خوێنەر دەبێ ئەوە بزانێت کە هیچ بەڵگە و نیشانەیەک لە بەردەستدا نییە کە نیشانی بدات تێگەیشتنی زۆر لیبراڵی شەرەفخان بە نیسبەت ئەوەی کە کورد لە سەدەی ١٦ دا کێ بووە، بە نیسبەت ئەو کەسانەی کە ئەو خستوونییەتە ناو پۆلێنی "کورد" وەڕاست دەگەڕێت. بە واتایەکی دیکە ئێمە ناتوانین بە دڵنیاییەوە بانگەشەی ئەوە بکەین کە تێگەیشتنی ئەمڕۆی ئێمە لە کۆمەڵگەی کورد بۆ قۆناغەکانی پێشووتر وەڕاست دەگەڕێت. بەهەرحاڵ چەمکی "کورد" ئەوەندە ڕوون و شەفاف بووە کە نووسەرێکی کورد، وەک یەکینەیەکی شیکاری مێژوویی کردوویەتی بە بابەتی توێژینەوەی خۆی. لەمە زیاتر گەڕاندنەوەی ڕەگوڕیشەی گەلێ لە بنەماڵە کوردەکان بۆ سەر بنەچەی عەرەبی لەگەڵ بیرۆکەی شوناسێکی کوردی جیاواز ناتەبا نەبووە. کەوابوو بە بۆچوونی من لە هەزار ساڵی یەکەمی مێژووی ئیسلامدا، ئیسلام خۆی بەسەر شوناسە محەللییەکاندا سەپاندووە و داوای لێکردوون وەک ئەندامی "امە" لە ڕووی سیاسییەوە پێی وەفادار بن. ئەمە نیشانەی ڕەوتێکی یەکلایەنە کە تێیدا ئیسلام شوناسە محەللییەکانی شکڵ پێداوە و خستوونیەتییە ناو قاڵبی کۆمەڵگەی ئیمانداران یا "امە"ی ئیسلامی. شوناسە محەللییەکان لە ئەنجامی ئەم ڕەوتەدا لە ناو نەچوون، بەڵام پەیوەندییان لەگەڵ ڕاستییە

سیاسییەکانی سەردەم نەما، لانیکەم تا ئەو شوێنە کە پەیوەندی بە سەروەرییەکانی عەشیرەتییەوە هەبووە .

کەوابوو هیچ سەرچاوەیەک لە بەر دەستدا نییە کە ئەو بانگەشەیە بسەلمێنێت کە کوردەکان وەک گروپێکی جیاواز، کۆمەڵگەیەکی سیاسییان پێکهێناوە، بەڵکو کۆمەڵێک سەرچاوەمان لە بەردەستدایە کە ئاماژەیان بە کۆمەڵێک عەشیرەت کردووە کە مۆرکی کوردیان لێداون. هەربۆیە ئێمە ناتوانین باسی ڕەوتێکی دیالێکتیکاڵ یا دیالۆجیکاڵ بکەین کە لەگەڵ ئیسلام وەک کۆمەڵگەیەکی یەکدەست کارو کاریگەری بووبێت.

نزیکەی ١٠٠ ساڵ دوای نووسینی شەرەفنامە، یەکەم دەربڕینی شوناسی تایبەتی کوردی دەبینین کە وەک گروپێکی سیاسی لە قەڵەم دەدرێت، مەبەست ئەو کاتەیە کە ئەحمەدی خانی، شاعیری کورد و پیاوی ئایین، داوای پادشایەکی کورد دەکات.

## ئەحمەدی خانی و ڕەوتی دیالۆجیکاڵ

ئەحمەدی خانی ساڵی ١٦٥١ لە گوندی "خان" لە حەکاری لەدایک بوو (١٥). لەوانەیە ئەحمەدی خانی ناوی خۆی لە زێدی خۆی وەرگرتبێت و لەوانەشە لە ناوی عەشیرەتی خانی یا بنەماڵەی خانییەکان وەریگرتبێت کە خۆی ئەندامی ئەم عەشیرەتە بوو. خانی زمانی کوردی (زاراوەی کرمانجی)، عەرەبی، فارسی و تورکی دەزانی و شارەزای ئەستێرەناسی بوو. هەروەها خانی وەکو پیاوێکی ئایینی زۆر سەفەری بۆ ناوچەکانی نێوان قەڵەمڕەوی عوسمانی و سەفەوی دەکرد، بەڵام زۆرتر هەر لە جزیرە دەژیا کە ناوەندی کولتووریی ناوچەکە بوو. خانی ساڵانی کۆتایی ژیانی

خۆی لە دوغوبایەزید[112] بەسەر برد و ساڵی ١٧٠٧ هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد. مەزاری خانی لە نزیک کۆشکی ئیسحاق پاشا[113] لە دوغوبایەزید هێشتا لە لایەن خەڵکەوە زیارەت دەکرێت.

کەسایەتی خانی کاریگەری زۆری کردووەتە سەر کەسایەتییە کوردە رۆشنبیرەکانی سەدەی ٢٠، لەوانە سەعید نورسی.

ئەحمەدی خانی نووسەری کتێبی "نەوبەرا بچووکان"[114] (کە فەرهەنگێکی عەرەبی-کوردییە) و "عەقیدا ئیمان"٢٠ (دەربارەی باوەڕی بە ئیسلام)-ە. بەهەرحاڵ ناوبانگی خانی زیاتر بەهۆی کتێبێکی دیکەیەتی بە ناوی "مەم و زین" کە لە ساڵی ١٦٨٤ دا هۆنراوەتەوە. خانی بۆ هۆنینەوەی مەم و زین لە دیوانێکی دیکە بە ناوی مەمی ئالان ئیلهامی وەرگرتووە کە بە شێوەی زارەکی پشتاوپشت لە ناوچەکەدا گوازراوەتەوە. "مەم و زین"ی ئەحمەدی خانی لە ڕواڵەتدا چیرۆکی ئەوینداری نێوان مەم و زینە، بەڵام بەشێکی لەژێر ناوی "ئێشێن مە"ی تێدایە کە بەشێکی گرنگە و گرنگییەکەی لەوەدایە کە خانی هەندێ بەرچاوڕوونیمان دەداتێ دەربارەی ئەوەی کە چۆن خانی وەک گروپێکی سیاسیی جیاواز کە پێویستی بە دەوڵەتی خۆی هەیە، بیری لە کورد کردووەتەوە:

ئەز مامە د حیکمەتا خودێ دە
کرمانج د دەولەتا دنێدە
ئایا ب چ وەجە مانە مەحرووم،

---

Dogubeyazit-[112]
Ishakpasha-[113]
Nubara BiÇukan-[114]

بیلجوملە ژ بۆ چ بوونە مەحکووم

.......

گەر د هەبوو وا مە ئیتیفاقەک

ویک را بکرا مە ئینقیادەک

ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی

هەمییان ژ مەرا دکر غەلامی

تەکمیلێ دکر مە دین و دەوڵەت

تەحسیلێ دکر مە عیلم و حیکمەت (١٦)

بە لەبەرچاو گرتنی گرنگی ئەم بەشەی مەم و زین و لەبەرچاو گرتنی ئەو ڕاستییە کە ئەم دیوانە شیعرە بە زاراوەی کرمانجی زمانی کوردی هۆنراوەتەوە، کوردە ناسیونالیستەکانی ئێستا "مەم و زین"ی ئەحمەدی خانی وەک "حیماسەی نەتەوەیی کوردەکان" سەیر دەکەن. لایەنی ناسیونالیستی مەم و زین لە شوێنەکانی دیکە لەم کتێبەدا باسکراوە (١٧)، بۆیە من لێرە تەنها دەمەوێت لەسەر تێگەیشتنی خانی لە شوناسی کورد چڕ ببمەوە و دەوری ئیسلام لەم تێگەیشتنەدا هەڵبسەنگێنم.

خاڵی یەکەم ئەوەیە کە تێگەیشتنی خانی لە کورد لەگەڵ تێگەیشتنی قۆناغی نوێ جیاوازە. هەندێ لە توێژەران لە کاتی هەڵسەنگاندنی ڕەهەندی ناسیونالیستی "مەم و زین"دا، بە نادروست دەڵێن کە مەبەستی خانی کۆمەڵگەی کورد بە گشتی بووە، بەڵام ئەگەر بێت و لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە سەر مەم و زین بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم هەڵسەنگاندنە ڕاست نییە. ئەوە ڕاستە کە خانی تێگەیشتنێکی ڕوونی

له بارودۆخی کوردەکان لە ناو دەوڵەتی عوسمانی (رووم)، ئێرانی (عەجەم) و گورجی (گورجستان)هەبووە، بەڵام بەهەرحاڵ مەبەستی له کورد، تەنها کوردە کرمانج زبانەکان بووە. بەڵگەی قەناعەتپێهێنەر بۆ سەلماندنی ئەم بانگەشەیە ئەوەیە کە خانی وشەی "کورد"ی لە مەم و زین دا لە شوێنێک بەکارهێناوە کە ویستبێتی وشەی "کرمانج" لە باتی کورد یا کۆ عەرەبییەکەی (واتا الاکراد) بەکار بهێنێت.

هەروەها هیچ نیشانەیەکی دیکە لەبەردەستدا نییە کە نیشانیبدات گروپە کوردەکانی دیکە وەک گۆرانی، سۆرانی، لوڕی یا دیمیلی (مەبەستی زازاییە – وەرگێڕ) لەم تێگەیشتنەی خانی لە کورد جێی هەبووبێت. لەوانەیە خانی بە زانابییەوە تەنها باسی کوردە کرمانجەکانی کردبێت و (لەوانەشە تەنها مەبەستی کرمانجە عەشیرەتییەکان بووبێت) چونکە هەروا کە دەزانین خانی، شەرفنامەی شەرەفخانی بتلیسیشی خوێندبووەوە کە تێیدا کۆمەڵگەی کورد بە شێوەیەکی بەرفراوانتر باس کراوە و نیمچە گروپە زمانییەکانی دیکەی لەخۆ گرتووە. خانی ئاگای لەم ڕوانگە بەرفراوانترە دەربارەی شوناسی کورد هەبوو کە تا ڕادەیەک لە تێگەیشتنی ئەمڕۆ لە شوناسی کورد نزیکە. بەهەرحاڵ خانی وای بە باشتر زانیوە کە کورد تەنها بە کرمانج زمانەکان دابنێت .بەداخەوە ئێمە بە دروستی نازانین کە بۆ خانی ڕوانگەیەکی بەرتەسکی بەنیسبەت شوناسی کورد هەبووە، لە کاتێکدا کە دەیزانی پێناسەی شوناسی کورد لەوە بەرفراوانترە.

بەهەرحاڵ تێگەیشتنی خانی لە شوناسی کورد هەرچی بێت، هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە خانی (وەک شەرەفخان) جۆرێک شوناسی کوردی

زەق کردووەتەوە کە لادانێکی گرنگە لە قۆناغەکانی پێشووتر کە تێیدا شوناسی ئیسلامی، شوناسی کوردی خستبووە ژێر تەم و مژی خۆی. خانی شوناسی کوردی-کرمانجی زەق کردووەتەوە بێ ئەوەی ڕەوایەتی کۆمەڵگەی ئیسلام بباتە ژێر پرسیارەوە. لەم ڕووەوە جەختکردنەوەی خانی لەسەر شوناسی کورد دەکرێت وەک ئەنجامی کاروکاریگەری دیالۆجیکاڵی سەیر بکرێت کە تێیدا شوناسی محەللی (کوردی-وەرگێڕ) لەگەڵ ئیسلامدا پەیوەندی هەیە نە ئەوە کە لەگەڵی ناتەبا بێت.

پرسیارێکی گرنگی دیکە کە دێتە ئاراوە ئەوەیە، کە بۆ ئەم ڕەوتە لە سەدەی ١٧ دا سەریهەڵدا، بە واتایەکی دیکە چی لە سەدەی ١٧دا ڕوویدا کە کۆمەڵگەی بۆ سەرهەڵدانی شوناسە محەللییەکان ئامادە کرد؟

وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەندی بە کەشوهەوای سەربازیی و سیاسیی ئەو سەدەیەوە هەیە، چونکە لەو سەدەیەدا دوو ئیمپراتۆری سەرەکی (واتا ئیمپراتۆری عوسمانی و سەفەوی) لە ناوچەیەک کە زیاتر کوردنشین بوو، لە ناو شەڕێکی بێ کۆتایی بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات گیریان خواردبوو، وادیارە کە تا ڕادەیەک ئاگایان لە ئینشیقاقە سیاسییەکانی نێو ئیسلام هەبوو، واتا ئەو ئینشیقاقانە کە لە لایەن ئیمپراتۆری عوسمانی و سەفەوییەوە بەهۆی ململانێکانیان بۆ گرتنەدەستی دەسەڵاتی ناوچە، بەرهەست دەبوو. ئەم ململانێ توندە بوو کە ڕێگای بۆ پێداگرتن لەسەر شوناسە محەللییەکان و پێویستیی بوونی پێکهاتەیەک بۆ داکۆکیکردن لە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی ناوچەی خۆش کرد.

بە پەرۆشبوونی خانی بۆ ئەوەی پادشایەکی کرمانج سەرهەڵبدات، لەم چوارچێوەیەدا باشتر دەرکی پێدەکرێت لە باتی ئەوە کە لەگەڵ ڕوانگەی

سیاسی سەدەی ١٩ دا قیاس بکرێت کە بووە هۆی لەدایکبوونی ناسیونالیزم.

لەگەڵ ئەمەشدا هیچ گومان لەوەدا نییە کە خانی و پێشەکییەکەی لە "مەم و زین" دا سەرچاوەگەلی زۆر گرنگن بۆ ناسیونالیستە کوردەکانی سەدەی ٢٠. تێگەیشتن و فێرکارییەکانی خانی لە شوناسی کورد کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر گەلێ لە ڕۆشنبیرانی کوردی سەدەی ٢٠ هەبووە. بەهەرحاڵ ئەم کاریگەرییە بە جوانترین شێوە لەسەر کەسایەتییە کوردە میانڕەوە موسڵمانەکان وەک سەعید نورسی ڕەنگی دایەوە کە دەڵێت: بوونی شوناسە محەللییەکان یارمەتی بە ئیسلام دەدات نەک ئەوە کە دژی ئیسلام بێت.

## ئیسلام و کورد لە سەدەی ٢٠دا: دزەکردنی ناسیونالیزم

تا سەدەی ١٩، باڵادەستی ئیسلام لە دابینکردنی شوناسێکی زاڵ بۆ گەلێ لە کۆمەڵگەکانی قەڵەمڕەوی ئیسلام یەکجار زۆر جێگای مشتومڕ بوو. بە دزەکردنی ناسیونالیزم بۆ ناو سەرزەمینە ئیسلامییەکان و بە لەیەکهەڵوەشانەوەی دوایین ئیمپراتۆری گەورەی ئیسلام (ئیمپراتۆری عوسمانی) و نا توانایی ئەم ئیمپراتۆرییە بۆ داکۆکیکردن لە بەرژەوەندی هاووڵاتیانی خۆی، ناسیونالیزم جێپێیەکی لە سەرزەمینە ئیسلامییەکاندا دۆزییەوە. کوردەکان لەپاڵ عەرەبەکان، تورکەکان، ئالبانیاییەکان و فارسەکاندا زۆر بەشوێن ڕێگاگەلێکدا دەگەڕان تا جۆرە ناسیونالیزمێک هەڵبژێرن کە لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئیسلامدا ناتەبا نەبێت. لە سەدەی ٢٠ ڕەوتی مۆنۆلۆجیکاڵ کە تێیدا ئیسلام تا ڕادەیەکی زۆر (نە بە تەواوی)

بەرپرسیار بوو لە بەرامبەر شکڵپێدانی شوناسی کورد، ڕێگای بۆ سەرهەڵدانی ڕەوتی دیالێکتیکاڵ خۆش کرد. ئەکتەرانی ناکۆک لەم ڕەوتە دیالێکتیکاڵەدا، ناسیونالیزم و ئیسلام بوون. ناسیونالیزم کە بەئەستەم دەیتوانی شان لە شانی باڵادەستی ئیسلامدا بدا، لەگەڵ ئیسلامدا ڕکابەری دەکرد، چونکە وەفاداری سیاسی خەڵکی بەرەو لای خۆی ڕادەکێشا. ناسیونالیزم بە سەرلەنوێ شرۆڤەکردنی پرەنسیپگەلێک وەک یەکێتی سیاسی سەرجەم موسڵمانان، پارامیترەکانی شوناسی کوردی سەرلەنوێ پێناسە کردەوە. یەکێک لە بەرچاوترین نموونەکانی ئەم ڕەوتی دیالێکتیکاڵییەی پێکهاتنی شوناسی کورد لە پەیوەندی لەگەڵ ئیسلامدا، بزوتنەوەی "نوورجو"ە، بەتایبەت قۆناغی پاش مردنی سەعید نورسی (١٨٧٦-١٩٦٠) کە دامەزرێنەری بزوتنەوەکەیە.

هەر لە کۆنەوە بزوتنەوە ئیسلامییەکان داکۆکی لە یەکگرتوویی "امە"ی (ئیسلامی-وەرگێڕ) دەکەن و ڕەخنە لە شێوە جۆراوجۆرەکانی شوناسی گروپە بەرتەسکەکان وەک عەشیرەتچێتی و ناسیونالیزم دەگرن. بەهەرحاڵ هەروەها کە لە درێژەی ئەم باسەدا نیشانیدەدەین، یەکێ لە لقەکانی بزوتنەوەی نوورجو واتا "مەکتەبی مەدزەهرا"[١١٥] سەنتیزێکی لە ناسیونالیزم و ئیسلام لە چوارچێوەی کورددا دروستکردووە کە دەبێت بە وردی و بە دیقەتەوە هەڵبسەنگێندرێت.

سەعید نورسی لە ناو بنەماڵەیەکی ئایینی لە گوندی نورس سەر بە بتلیس هاتە دنیا. سەعید نورسی بەهۆی ئەوەی کە کورد بوو، تا ناوەڕاستی دەیەی ١٩٢٠ هەر بە سەعید کوردی ناوبانگی هەبوو(١٨).

---

[115] Med Zehra Ecole-

نورسی لە سەرەتای خوێندندا لە حوجرەی شێخەکانی نەقشبەندی لە نورشین[116] (گوندێکی نزیکی بتلیس) و هەروەها تەکیەی موکوس و ئەرواس[117] لە وان فەقێتی کرد. بەهەرحاڵ نورسی نەچووە ڕیزی تەریقەتی نەقشبەندی و بزوتنەوەکەی خۆی وەک بزوتنەوەیەکی سۆفیگەرانە نەناساند. نورجووەکان خۆیان وەک ئیسلامییە میانەڕەوەکان دەناسێنن و ڕەگوبنەچەی ڕۆشنبیری خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ جمال الدین الافغانی[118] کە زانایەکی موسڵمانی ڕیفۆرمخوازی سەدەی ١٩ بووە.

نورسی یەکەمجار بەهۆی داواکردنی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامی لە پارێزگا کوردنشینەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی ناوبانگی دەرکرد. نورسی ناوی ئەم زانکۆیەی نا "مدرسە الزهرا" و بە مەبەستی دامەزراندنی ئەم زانکۆیە لە وان چوو بۆ ئیستانبوڵ بۆ ئەوەی خۆی ڕاستەوخۆ ئەم داواکارییە لەگەڵ "سوڵتان عەبدولحەمید" ی دووەم باس بکات. بەهەرحاڵ هەرچەند کە نورسی بۆ وەدیهێنانی ئاواتەکەی لە پێناو دامەزراندنی ئەم زانکۆیە کۆمەڵێک یارمەتی ماددی لە خەڵک کۆ کردەوە و بەردی بناغەی ئەم زانکۆیەی لەساڵی ١٩١٣ دا دامەزراند، بەڵام بەهۆی شەڕی باڵکان و پاشان شەڕی یەکەمی جیهانی ئەم زانکۆیە قەد دانەمەزرا.

پاش لەیەکهەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی، نورسی لەگەڵ دەوڵەتی نوێی کەمالیست لە تورکیا پەیوەندی گرت و لە ساڵی ١٩٢٢ واتا ٢ ساڵ پێش لە هەڵوەشانەوەی دەزگای خەلافەت، لەگەڵ مستەفا کەمال،

---

Nurshin-[116]

Mukus and Arvas-[117]

- [118] Jamaladdin Al-Afghani

دامەزرێنەری کۆماری تورکیا لە ئانکارا دیداری کرد و پێداگری لەسەر کرد کە ئەوە قبوڵ بکات کە حکومەتی نوێ لەسەر بنەماکانی ئایینی ئیسلام دابمەزرێت. بەهەرحاڵ ڕژێمی نوێ ڕژێمێکی سەربازی سیکولار بوو و تەبیعەتەن گومانی خراپی بە نیسبەت قەسد و نیازەکانی سەعید نورسی هەبوو. لە ١٩٢٥ پاش ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران کە بوو بە هەڕەشە بۆ دەوڵەتی سیکولاری تورکیا، سەعید نورسیش بە تۆمەتی ئەوەی کە گوایا یارمەتی بە ڕاپەڕین داوە، گیرا و هەرچەند کە دەوڵەتی تورکیا نەیتوانی ئەم تۆمەتە بسەلمێنێت، بەڵام دیسان نورسی بۆ بارلا[119] (شارێکی بچووک لە ئیستیپارتا[120]) دوور خرایەوەو لە وێ ڕیسالە بە ناوبانگەکەی بە ناوی "ڕیسالەی نوور" نووسی کە تەفسیرێکی هاوچەرخانە لە ئایینی ئیسلام بوو.

هەرچەند کە نورسی خۆی لە دوورە وڵاتیدابوو، بەڵام بزوتنەوەکەی پێشکەوت و مورید و ئەو شوێنکەوتووی زۆری لە نێو سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگە (لەوانە ئەوانەی کە پیاوی حکومەت بوون) دۆزییەوە. لە هەڵبژاردنی گشتی ساڵی ١٩٥٠، پارتی دیموکرات کە پارتێکی سیاسی بوو، لە لایەن گروپگەلی ئیسلامی وەک بزوتنەوەی نوورجو پشتیوانی لێکرا و گەیشت بە دەسەڵات. لەم قۆناغەدا بوو کە کۆمەڵە وتارەکانی "ڕیسالەی نوور" بە شێوەی یاسایی بە ئەلفوبێی لاتین چاپ و بڵاو بووەوە و لایەنگر و موریدی زۆرتری بەرەو لای بزوتنەوەکە ڕاکێشا.

---

119- Barla

120- Isparta

سەعید نورسی لە ٢٣ی مارسی ١٩٦٠ لە کاتی سەفەر بۆ ئورفا کۆچی دوایی کرد و هەر لەو شارە بەخاک سپێزدرا. بەهەرحاڵ پاش کودەتای سەربازی ١٩٦٠ کە بووە هۆی ڕووخانی حکومەتی پارتی دیموکرات و پاشان عەدنان مەندەرەسی سەرۆک وەزیران لەگەڵ دوو لە وەزیرەکانی (فاتین ڕۆشتو زۆرلوو و حەسەن پولاتکان[١٢١]) لە سێدارەدران، پاشماوەی نورسییەکان چوون بۆ شوێنێکی نادیار بۆ ئەوەی نەکا گۆڕەکەی سەعید نورسی ببێت بە ناوەندێک بۆ ڕاکێشانی موریدەکانی.

پاش مەرگی سەعید نورسی، بزوتنەوەی نوورجو تووشی ناکۆکی و ئینشیقاقی ناوخۆیی زیاتر بوو (١٩). بەهەرحاڵ ئێمە لێرە تەنها باسی "مەدزەهرا"دەکەین کە لقێکی ئەم بزوتنەوەیە بوو، چونکە زۆر بە ڕوونی کاریگەری دوو لایەنەی ئیسلام و ناسیونالیزم لەسەر شوناسی کورد نیشاندەدات. من ئەم کاریگەرییە تەنها وەک کاردانەوەیەکی سەنتێزی نێوان دوو فەلسەفەی سیاسی ناتەبا واتا ئیسلام و ناسیونالیزم دەبینم، چونکە ئیسلام خوازیاری شوناسێکی جیهانییە، بەڵام ناسیونالیزم داوای شوناسێکی تایبەت دەکات.

بزوتنەوی"مەدزەهرا"یەکێ لە نموونە ڕوونەکانی وەرگرتنی ناسیونالیزم لە لایەن بزوتنەوەیەکی ئیسلامییەوەیە و بە ڕوونی نیشانیدەدات کە چۆن شوناسی کورد (کە لە لایەن خوێندنەوەیەکی جیهانی لە ئیسلام پاوان کراوە) وەڵامی ناسیونالیزمێکی گونجێندراو لە ناوخۆدا دەداتەوە کە ئیدوئولوژییەکی سیاسی زۆر بەهێزە کە لەگەڵ ئیسلام ڕکابەری دەکات بۆ ئەوەی شوناسی خەڵک سەرلەنوێ پێناسە بکاتەوە.

---

Fatin Ruştu Zorlu and Hasan Polatkan–[121]

پاش مەرگی سەعید نورسی، بە تایبەت لە دەیەی ۱۹۷۰، کۆمەڵێک جیابوونەوە لە ناو بزوتنەوەی "نوورجو"دا ڕوویدا. ئەم جیابوونەوەیە زۆرتر بەهۆی جیاوازی بیرورِا سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەک بۆ پرِوپاگەندەکردنی ڕوانگە جیهانییەکانی بوو. گروپێک لە نوورجووەکان کە بە ئاشکرا لە ناو سیاسەتدا تێوەگلابوون، لایەنگری بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەکی وەها بوون، بەڵام بەهەرحاڵ گروپێکی دیکە دژی بیرۆکەی بڵاوکردنەوەی ئەم ڕۆژنامەیە و تێوەگلان لەناو سیاسەتدا بوون (۲۰).

یەکەمین گروپێک کە لە ئەنجامی ئینشیقاق لەناو نوورجوودا سەریهەڵدا، بزوتنەوەی "یەنی ئاسیا"[۱۲۲] (یانی کیشوەری ئاسیای نوێ-وەرگێر) بوو کە ڕۆژنامەیەکی بەهەمان ناو بڵاو کردەوە. بزوتنەوەی "یەنی ئاسیا" ماوەیەکی کورت پاش ئەوە لە لایەن گروپێکی دیکەی نوورجوو واتا "مەدزەهرا"وە ڕەخنەی لێگیرا . "مەدزەهرا" دەیگوت "یەنی ئاسیا" واتاکانی "ڕیسالەی نوور"ی چەواشە کردووە.

ساڵی ۱۹۸۹ "مەدزەهرا" دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەک بە ناوی "دەعوا"[۱۲۳] کە تێیدا تەنها پرِوپاگەندەی بۆ هەڵوێستی خۆی دەکرد. "مەدزەهرا" کە لە لایەن "م س سەیهانزادە"[۱۲٤]وە ڕێبەرایەتی دەکرا، بە چەند شێوە لە گروپەکانی دیکەی نوورجوو جیاواز بوو: یەکێ لەم شێوانە کە پەیوەندی بەم وتارەی ئێمەوە هەیە، ئەوەیە کە "مەدزەهرا" گرنگی بە شوناسی کورد و ناسیونالیزمی کورد دەدا (۲۱). "مەدزەهرا" پێداگری

---

122- Yeni Asya

123- Dava

124- M.S.Seyhanzade

لەسەر ئەوە دەکرد کاتێک کە دەقی ئەسڵی "ڕیسالەی نوور"بە ئەلفوبێی لاتین چاپ بووە، هەندێ لە گروپەکانی نوورجوو وشەگەلی "خەڵکی ڕۆژهەڵات" و گوندییەکانیان" خستووەتە جێگای وشەی "کورد" و "کوردستان". لە ڕاستیدا "مەدزەهرا" بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە هەندێ لە برگەکانی ئەم ڕیسالەیە کە باسی ڕژێمی سیاسی کۆماری تورکیای کردووە، بە تەواوی لە دەقی "ڕیسالەی نور"دا سڕاوەتەوە (٢٢).

"مەدزەهرا" بە چڕبوونەوە لەسەر ڕابردووی کوردی سەعید نورسی، دەیگوت: هەموو گروپێکی ئەتنیکی دەبێ دەوڵەتی خۆی هەبێ و پاشان ئەم دەوڵەتانە دەبێ فدراسیۆنێکی ئیسلامی پێکبێنن. "مەدزەهرا" دەیگوت: کوردەکان دەبێ "کۆماری ئیسلامی کوردستان" یان هەبێت و ئەم دەوڵەتە ئەندامی فدراسیۆنی دەوڵەتە ئیسلامییەکان بێت. بە وتەی "مەدزەهرا" ئەم فدراسیۆنە دژی پرەنسیپی "امە"ی ئیسلامی نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم کیانە سیاسییە دەبێتە هۆی خۆشبەختی سەرجەم کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بێ ئەوەی لە لایەن کۆمەڵگە موسڵمانەکانی دیکەوە بچەوسێندرێنەوە. فولای ئاتاجان[١٢٥] کە کەسایەتییەکی ئاکادیمیکی تورکە و پسپۆڕی بزوتنەوە ئیسلامییەکانی تورکیایە، دەڵێت: "سەعید نورسی لایەنگری یەکگرتوویی ئیسلام بوو کە تێیدا هەر نەتەوەیەک یا گروپێکی ئەتنیکی بتوانێ زمان، دابونەریت و کولتووری خۆی بەڕێوەببات. ئیسلام چوارچێوەیەک دەخاتەڕوو کە تێیدا سەرجەم خەڵک دەبێ بتوانن شوناسی خۆیان بپارێزن" (٢٣).

---

Fulay Atacan-[125]

ئەم بۆچوونە هەڵوێستی "مەدزەهرا" بە باشی ڕووندەکاتەوە دەربارەی ئەوەی کە چۆن ناسیونالیزمی کورد و ئیسلام دەتوانن پێکەوە تەبا بن. لێرە پرسیارەکە ئەوە نییە کە ئایا پاراستنی شوناس، زمان، داب و نەریت و کولتووری ئەتنیکێک، بێ بردنە ژێر پرسیاری پرەنسیپەکانی "امە" لە ئیسلامدا ڕێگەپێدراوە یا نا. لەمە زیاتر لەوانەیە بە شێوەیەکی مەعقول بڵێین کە ئیسلام بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە، شوناسێکی ئیسلامی بێ وێنەی بە بەهای لەناوچوونی شوناسە بەرتەسکەکانی دیکە دروستکردووە.

پرسیارەکە ئەوەیە کە بۆ هەوڵگەلێکی وەها بۆ ڕەوایەتیدان بە گرنگی شوناسە ئەتنیکییەکان لە چوارچێوەی ئیسلامدا لە سەدەی ٢٠ سەرێهەڵدا و لەگەڵ سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی ناسیونالیزم لە سەرزەمینە ئیسلامییەکاندا هاوکات بوو. ئەم توێژینەوەیەی ئێمە نیشانیدەدات کە وەڵامی ئەم پرسیارە لە خەباتی ناسیونالیزم دژی زاڵبوونی ئیسلام لە چوارچێوەی ڕاکێشانی وەفاداری سیاسی خەڵکدایە. زۆر ڕوونە کە هەوڵەکانی "مەدزەهرا" بۆ داهێنانی چوارچێوەیەک کە تێیدا سەنتیزێک لەنێو دوو هێزدا (مەبەستی ئیسلام و ناسیونالیزمە - وەرگێڕ) دروست ببێت، سەرکەوتوو بووە. ئەم سەنتیزە ئەنجامی ڕەوتێکی ڕۆشنبیرییە کە لە سەدەی ١٩دا دەستی پێکرد و تێیدا کەسایەتیگەلێکی ڕیفۆرمخواز وەک سید جمال الدین الافغانی و حسن البنا[١٢٦] و کەسانی دیکە هەستیان بە پێویستی ئەو هەڵێنجاندنانە دەکرد کە ئیسلام و پۆزێتیڤیزم (ئەو پۆزێتیڤیزمە کە لە ڕۆژئاوا هەیە) پێکەوە تەبان. لە سەدەی ٢٠دا موریدان و ئەو شوێنکەوتووانەی ئەم هێڵە ڕۆشنبیرییە، ناسیونالیزمیشیان بەسەر ئەم

Hasan Al-Banna-[126]

لیستەدا زیاد کرد. لە ئەنجامدا شوناسی کورد قۆناغ بە قۆناغ هەتا قۆناغی ئێستای خۆی هاتووە و پێشکەوتووە و ئیسلام هێشتا دەوری گرنگی تێدا دەبینێت. لەگەڵ ئەمەشدا جەختکردنەوە لەسەر ئەتنیسیتە و ناسیونالیزم، ڕەنگێکی جیاواز بە سەر سیمای (وێنای) کورددا زیاد دەکات.

## ئەنجام

پاش ئەوە کە کوردەکان لە سەدەی ٧ی زایینی هاتنە سەر ئایینی ئیسلام، کاروکاریگەری نێوان ئیسلام و شوناسی کورد دەکرێت بە باشترین شێوەی خۆی وەک ڕەوتێکی مۆنۆلۆجیکاڵ وەسف بکرێت. لەم قۆناغە سەرەتاییەدا، ئیسلام شوناسێکی جیهانی نوێی لە ڕێگای دانانی شوناسە محەللییەکان لە قاڵبی"امە" و داواکردنی وەفاداری سەرجەم موسڵماناندا، سەپاند. لە هەزارەی یەکەمی خۆیدا، ئیسلام بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە کۆمەڵگەیەکی گەورەی لەگەڵ شوناسێکی نوێ و جیاواز دروستکرد.

شوناسە محەللییەکان هەرچەند کە بە تەواوی نەتوانەوە، بەڵام هەتا سەدەی ١٧ کاڵ بوونەوە و کەم ڕەنگ بوون، واتا تا ئەو کاتە کە ململانێی ئیمپراتۆری عوسمانی و سەفەوی لەسەر دەسەڵاتی سیاسی لە ناوچە بوو بە هەڕەشە بۆ سەر کۆمەڵگە محەللییەکان. لە کوردستاندا بەهۆی ئەوەی کە ئینشیقاقە سیاسییەکان لە ناو ئیسلامدا بەرهەستتر و زەقتر بوو و لە ئەنجامی سەرهەڵدانی ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویدا و بەهۆی ئەوەی کە ئەم ململانێیە ڕۆژبەڕۆژ زیاتر ژیانی خەڵکی ناوچەی دەخستە ناو مەترسی، ڕۆشنبیرانی کورد دەستیان کرد بە پێداگرتن لەسەر جیاوازبوونی شوناسی کورد و داوای دەوڵەتێکی دیکەیان کرد کە بتوانێ بەرژەوەندی کۆمەڵگە محەللییەکان بپارێزێت. جەختکردنەوەی ئەحمەدی خانی لەسەر شوناسی کوردی-کرمانجی وەک شوناسێکی جیاواز و پەرۆشییەکەی بۆ سەرهەڵدانی پادشایەکی کرمانج بۆ ئەوەی لەگەڵ

ئیمپراتۆری عوسمانی و سەفەویدا ڕکابەری بکات، دەبێ لەم چوارچێوەیەدا (نەک لە چوارچێوەی ناسیونالیستیدا) سەیر بکرێت.

شایانی ئامارەپێکردنە کە ئەحمەدی خانی خاوەن ڕەگوبنەچەی "عولەما"[127] بووە کە ئەمەش نیشاندەدات لە سەدەی ١٧دا تەنانەت کەسایەتییە ئایینییەکانیش دەستیانکرد بەوە کە لە کردەوەدا "امە" بە تاکە سەرچاوەی شوناس دابنێن. ئەڵبەتە ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە شوناسە محەللییەکان، پرەنسیپەکانی"امە"یان لانیکەم لە ئاستی فەلسەفیدا پشتگوێ خستووە، بەڵکو بەهەرحاڵ بە واتای ئەوەیە کە ڕەوتێکی نوێ بۆ شوناسی کورد دەستپێکرد، ڕەوتێک کە تێیدا پێداگرتن و جەخت کردنەوەکان کەم کەم بەرەو لای پێکهاتنی شوناسە بەرتەسکترەکان بە تایبەت لە بواری سیاسیدا، لار بووەوە. کەوابوو ئەو ڕەوتە کە بە ئەحمەدی خانی دەستپێکرد، دەبێ وەک ڕەوتێکی دیالۆجیکاڵ سەیر بکرێت و وەسف بکرێت، چونکە شوناسە محەللییەکان لەگەڵ بیرۆکەی "امە" ناتەبا نەبوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە شوناسێکی گروپی کاراتریان دروست کرد کە لەگەڵ ڕاستییە سیاسییەکانی ئەو قۆناغەدا باشتر دەگونجا.

لە سەدەی ٢٠ دا دزەکردنی ناسیونالیزم بۆ ناو سەرزەمینە ئیسلامییەکان بوو بە خاڵێکی گرنگ بۆ پێکهاتنی شوناسی مۆدێرنی کورد. ئیسلام وەک شوناسێکی سیاسی لە ئەنجامی سەرهەڵدانی ناسیونالیزم لەگەڵ ڕکابەرییەکی بەرچاو ڕووبەڕوو بووەوە. ئەگەر بێین و لەگەڵ ناسیونالیزمدا بەراوردی بکەین، دەبینین کە ئیسلام لە پێگەیەکی

---

Ulama-[127]

باشتردا بوو بۆ ئەوەی داوای وەفاداری لە خەڵک بکات. بەهەرحاڵ کاتێک کە جیهانی کریستیان (مەسیحی) حیسابی لەسەر لاوازبوونی ئیمپراتۆرییە ئیسلامییەکان کرد، کۆمەڵگە موسڵمانەکان بە شوێن ڕێگاگەلێکدا گەڕان تا ئیسلام و ناسیونالیزم پێکەوە بگونجێنن. من ئەم ڕەوتە بە ڕەوتێکی دیالۆجیکاڵ دەبینم، چونکە ئەمە سازشێکی نەخوازراو بوو، ئەگەرنا ئەم سازشە نەکرایا، ئیسلام و ناسیونالیزم لە یەکیان دەدا.

شایانی دووپاتکردنەوەیە کە شوناسی کورد پێش لە قۆناغی مۆدێرنیتە "ئانتی تیزی"٣٥ ئیسلام نەبوو، بەڵکو لە باشترین حاڵەتی خۆیدا سەنتیزێک بوو کە لە ئەنجامی ڕەوتێکی دیالۆجیکاڵدا پێکهاتبوو کە تێیدا کۆمەڵگەی کورد لەگەڵ ئیسلامدا لە وتووێژدا بوو بۆ ئەوەی زاڵبوونی ئایین بە سەر شوناسە محەللییەکاندا کەم بکاتەوە (٢٤). لە لایەکی دیکەوە شوناسی کورد لە قۆناغی مۆدێرندا تەنها و تەنها ئەنجامی ڕەوتێکی دیالۆجیکاڵ بوو. بەهەرحاڵ هێزە پێکدادەرەکان واتا تیز و ئانتی تیز، ئیسلام و ناسیونالیزم بوون. کوردەکان سەنتیزێکیان لەم دوو شتە وەک جۆرە شوناسێکی مۆدێرنی کورد دروستکرد و گونجاندیان، واتا شوناسێک کە ئیسلام و ناسیونالیزمی لە ڕێگای پشتگوێخستنی تەواوی ناکۆکییە غەریزییەکانی ئەم دوو چەمکە، پێکەوە گونجاند.

**سەرچاوە:**

**The Impact of Islam on Kurdish Identity Formation in the Middle East," in Evolution of Kurdish Identity Ed. Michael Gunter. Costa Mesa: Mazda Publishing, 2007.**

## پەراوێزەکان:

1-بنواڕن بۆ کتێبی:

Hakan Ozoglu, Kurdish Notables and the Ottoman State: Evolving Identities, Competing (Loyalties, and Shifting Boundaries (Albany, NY: State University of New York, 2004

2- من لێرە زۆرتر لەسەر لایەنە سیاسییەکەی ئیسلام (کە داوای وەفاداری تەواو لە باوەڕمەندانی خۆی دەکات) چڕ بوومەتەوە، کەوابوو من لەم وتارەدا وەک ئیدولوژییەکی سیاسی نزیکی ئیسلام بوومەتەوە.

3- دۆزینەوەی پێناسەیەکی بەرهەست بۆ ئەم دەستەواژەیە زەحمەتە. مەبەستی من لەم دەستەواژەیە "گروپێکە کە لەسەر بنەمای پەیوەندی خوێنی ڕاستەقینە یا ناڕاستەقینە پەیوەندییان پێکەوە هەیە یا کەسانی دیکە وایدادەنێن کە پەیوەندییان پێکەوە هەیە."

4 -عزالدین ابن الاسیر، الکامل فی التاریخ، بەرگی دووەم (بێروت، دارالکتاب العربی)، لاپەڕەی ٤٢٦-٤٢٧

5-عباس احمد ابن الجابر البلادهوری، ڕیشەکانی حکومەتی ئیسلامی: کتاب فتوح البیان، وەرگێڕانی فیلیپ خوری هیتی، بەرگی ١ (نیویۆرک، زانکۆی کۆلۆمبیا، ١٩١٦)، لاپەڕەی ٣١٩

6-من بەرەوپێشچوونی ناسیونالیزمی کوردم لە کتێبی :

Hakan Ozoglu, Kurdish Notables and the Ottoman State: Evolving Identities, Competing Loyalties, and Shifting Boundaries (Albany, NY: State University of New York, 2004

باس کردووە، بە تایبەت بنواڕن بۆ بەشی ٢ی ئەم کتێبە.

7- مارتین ڤان بروینسن، "کورد و ئیسلام"، پرۆژەی لێکۆڵینەوە ئیسلامییەکان، تۆکیۆ، ژاپۆن، ١٩٩٩. هەروەها بنواڕن بۆ پەراوێزی ٣

8-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

9 -من دەستەواژەی "چین"م لە پێناسە بەرفراوانەکەی خۆیدا بەکارهێناوە کە ڕەوەندەکانیش لەخۆ دەگرێت.

10- ئەم زانیارییانەم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە :

شرف الدین: "شەرەفنامە یا مێژووی نەتەوەی کورد" (بە زمانی فەڕەنسی)، وەرگێڕانی فرانسوا بێرنارد شارمۆی، بەرگی ١، سەنپیتیرزبورگ، ئاکادیمیای شاهانەی

زانستەکان،١٨٧٠، لاپەڕەی ١-١٠)، سەعید نەفیسی، بیتلیسی شرف الدین، ئینیسکلۆپیدیای ئیسلام، عیسمەت پارماکسیز ئوغلو: شەرەفخان: تورک ئانیسکلوپیدیسی، بەرگی ٣٠ (ئانکارا، میلی ئیگیتیم باسیمەوەی،١٩٨١)،"شەرەفخان: مەیدان لاروسی" (ئیستانبول، مەیدان یاییلاری،١٩٧٣)، بەکیر کوتوکئوغلو: "شەرەفخان"، ئیسلام ئانیسکلوپیدیسی، (ئیستانبول، میلی ئیگیتیم یاییلاری،١٩٧٠)، محمد تاهیر: "عوسمانلی مولەفلەری"، بەرگی ٣ (ئیستانبول، مەرال، ١٩٧٥، لاپەڕەی١٤٠) و سی ئا ستوویری: "ئەدەبیاتی ئێران: لێکۆڵینەوەیەکی کتێبناسی" (لەندەن، ١٩٢٧-١٩٣٩، لاپەڕەی ٣٦٦-٣٦٩).

11- مەبەستی شەرەفخان تەنها سەرچاوە غەیرە عەرەبییەکان نەبووە، بەڵام چونکە شەرەفخان زانیویەتی تورکی و فارسی بخوێنێتەوە و بنووسێت، ئەو سەرچاوانەشی بەکارهێناوە کە بەم زمانانە نووسراوە. لە ڕاستیدا شەرەفخان لە کۆتایی کتێبەکەیدا ناوی هەندێ لەم سەرچاوانەی نووسیوە. بنواڕن بۆ کتێبی "شەرەفخان: شەرەفنامە"، وەرگێڕانی محەمەد ئەمین بوزئەرسلان (ئیستانبول، هاسات،١٩٩٠، لاپەڕەی ١١ و ٥٢٨).

12-هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٠٧

13-هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٢٥

14-هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ١٣٥ بەڵام وەرگێڕ لە پەراوێزی ١٦٥دا ئەم ڕوانگەیەی بردووەتە ژێر پرسیار.

15- بنواڕن بۆ وتارەکەی مارتین ڤان بروینسن بە ناوی" ئەحمەدی خانی و دەوری وی لە سەرهەڵدانی هۆشیاری نەتەوەیی کورددا" کە لە کتێبی" کۆمەڵێک وتار دەربارەی ڕیشەکانی ناسیونالیزمی کورد" دا چاپ کراوە کە عەباس وەلی کۆیکردوونەتەوە و دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی "مەزدا" ساڵی ٢٠٠٣ لە ئەمریکا چاپ و بڵاوی کردووەتەوە.

16- ئەم شیعرانە عەزیز باوەڕمەند کردوونی بە ئینگلیزی و لە کتێبەکەی گینا لینۆ بە ناوی "ئاگر، بەرف و هەنگوین" (دەنگگەلێک لە کوردستانەوە)دا چاپ کراوە (سیدنی، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی هاڵستێد، ٢٠٠١) لاپەڕەی ٥٤٥-٥٤٧

17-بنواڕن بۆ کتێبی:

Hakan Ozoglu, Kurdish Notables and the Ottoman State: Evolving Identities, Competing (Loyalties, and Shifting Boundaries (Albany, NY: State University of New York, 2004

Martin van Bruinessen, "Ehmedi Xanis Mem u Zin and Its Role in the Emergence of Kurdish National Awareness," in Abbas Vali, ed., Essays on the Origins of Kurdish Nationalism (Costa Mesa, CA: Mazda, 2003), p. 40-57.

18-کەوابوو ئەو ناوی خۆی ناوە "سەعید نورسی" کە بە بدیع الزمان سعید نورسی"ش بەناوبانگە.

19-بۆ لێکدانەوەیەکی شایانی بایەخ دەربارەی ئەم مەسەلەیە بنواڕن بۆ وتارەکەی فولیا ئاتاجان بە ناوی"گروپێکی ئیسلامخوازی کورد لە تورکیای نوێدا: ئاڵوگۆڕ لە شوناسەکاندا" کە لە گۆڤاری "لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست"دا لە جولای ۲۰۰۱ بڵاو بووەتەوە (لاپەڕەی ۱۱۱-۱٤٤).

20-بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم جیابوونەوەیە و سەرهەڵدانی"مەدزەهرا ئیکۆل" بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو. من زانیارییەکان دەربارەی بزوتنەوەی "مەدزەهرا " و ڕوانگەکانیم لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە. هەروەها گرنگی تایبەتم بە نووسراوەکانی بڵاڤۆکی "دەعوا" داوە کە لە وتارەکەی ئاتاجاندا چاپکراوە.

21-هەندێ لەو تەوەرانە کە بە هۆیەوە "مەدزەهرا"بزوتنەوەی نوورجووی بردووەتە ژێر پرسیار بریتین لە مەسەلەی "بیرۆکەی دیموکراسی"،"دامەزرانی سیستەمی خەلافەت" و "دەستێوەردانی ڕۆژئاوا". بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

22-م س سەیهانزادە، "خوتبەی سەمیە"، گۆڤاری دەعوا، ژمارەی ٤٣-٤٤، ئۆکتۆبەر- نوامبری ۱۹۹۳، لاپەڕەی ۲۷-٤۷. هەروەها بنواڕن بۆ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ٦٥

23-هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی۱۲۱

24 -بۆ نموونە لەم قۆناغەدا کوردە ناموسڵمانەکان (ئیزەدی، ئەهلی حەق و تەنانەت کوردە عەلەوییەکان) وەک بەشێک لە کۆمەڵگەی کورد سەیر نەدەکران.

25-لەم قۆناغەدا شوناسی کورد هێڵی ئایینی تێپەڕاندووە و کوردە ناموسڵمانەکانیشی لەخۆ گرتووە.

# ناسیونالیزمی کورد و تەکنولوژی مودێرنی پەیوەندییەکان

## دەیڤید ڕۆمانۆ[١٢٨]

### پێشەکی

هەستکردن بە چەوسانەوە و بەقوربانیبوون، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ سەرهەڵدانی هەرچەشنە بزوتنەوەیەکی ناسیونالیستی. چەوسانەوە لەسەر بنەمای شوناسی ئەتنیکی، پاساوە بۆ تەیارکردن و بە سیاسیکردنی ئەتنیسیتە بە ئامانجی ئەوە کە داکۆکی لە کەسێک و گروپێک بکات. بەهۆی ئەوەی کە بزوتنەوە ناسیونالیستییە ئەتنیکییەکان دەبێ خۆیان لە

---

[128]- ئەم وتارە لە کاتی لێکۆڵینەوە و کاری مەیدانی بۆ خوێندنی دکتۆرا دەربارەی بزوتنەوە ناسیونالیستییە کوردییەکان ئامادە کرا. زۆر سوپاسی Quebecs Fonds pour la formation de Chercheurs et lAide à la Recherche، بەشی بەرگری ئاسایشی نەتەوەیی کانادا و بەشی لێکۆڵینەوەکانی بەرگری لە قۆناغی دکتۆرا و زانکۆی تۆرنتۆ دەکەم کە لە ڕووی مادییەوە بۆ ئەم پرۆژەیە هاوکارییان کردم. هەروەها زۆر سوپاسی ستافی پێداچوونەوەی گۆڤاری Journal دەکەم بۆ تێبینییەکانیان. هەروەها سپاسی ریچارد سەندبروک، ئەمیر حەسەنپوور، هادی ئێلیز، ئێلێن کۆتێرمەن و گرەیس لاتولیپ دەکەم بۆ خوێندنەوەی پێشنووسەکانی ئەم وتارە.

پەیوەندی لەگەڵ گروپەکانی دیکەدا پێناسە بکەن (١)، هەڕەشەکان (لە ناو شتەکانی دیکەدا) دەتوانێت ببێتە پاساو بۆ پێویستی هەڵسانەوە و داکۆکیکردن لە کەسێک یا گروپێک (٢). بەهەمان شێوە ڕووداوێک کە ببویەتە مایەی سووکایەتی پێکردن بەو ئەتنیکە یا ببوویەتە هۆی شکستی ئەو ئەتنیکە، دەتوانێت وەک پاڵپشتێک بکەوێتە خزمەتی دروستبوونی بزوتنەوەیەکی گەورەتر، یەکگرتووتر و سیاسیتر.

لە گوندی جیهانی ئەمڕۆدا کە بەرنامەی میدیاکان خێرا لە هەموو شوێنێک بڵاو دەبێتەوە، هێزی ئیحساسات و کاریگەری هاندەرانەی شکستێکی وەها زۆر بەرهەست دەبێت. تەکنۆلۆژی پەیوەندییە مۆدێرنەکان کارئاسانی بۆ ئەوە دەکات کە سۆز و هەستکردنی خەڵک بە شکست بەرەو تەیاربوون و هەنگاوهەڵگرتن بە ڕێکخستن بکرێت. بەشداریکردن لە خۆپیشاندانەکان و ئاگاداربوون لە خۆپیشاندانە هاوشێوەکان کە لە سەراسەری جیهاندا ئەنجامدەدرێت، لە لایەن ئەندامانی گروپەوە (کە ئەویش بەهۆی تۆڕی جیهانی میدیاکانەوە ئاسان بووە) لە سەرەتادا هەستێکی گەورەتری هۆشیاری ئەتنیکی و شوناسێکی ئەتنیکی سیاسی دروستدەکات. کەوابوو کاریگەری هۆکاری هاندەری هەستکردنی بەکۆمەڵ بە سوکایەتی پێکردن، ئەمڕۆ لە ڕابردوو بەهێزترە.

ئەم وتارەی ئێمە کوردەکان وەک نموونەی گروپێکی نەتەوەیی بێ دەوڵەت، سەرکوتکراو و دابەشبوو لە ڕووی خاکەوە دەخاتە بەر باس و ئەو هەڵێنجاندنە دەخاتەڕوو کە پێشکەوتنە شۆڕشگێڕانەکان لە پەیوەندییەکاندا، کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لەسەر گەشەکردنی ئەو گیروگرفتانە بووە کە ناسیونالیستە ئەتنیکییەکان بۆ دەوڵەتەکان دروستی

دەکەن. شتی زۆر سەبارەت بە کاریگەری هیژمۆنتیکی میدیاکان و لەناوچوونی ئەو کولتوورانە کە پەیوەندی باشیان لەگەڵ تەکنۆلۆژی پەیوەندییە مۆدێرنەکاندا نییە نووسراوە، بەڵام لەم نووسینانەدا سەرنج بەوە نەدراوە کە ئەم تەکنۆلۆژییە پوتانسییەلی ئازادکردنیشی تێدایە (٣). شۆڕشی پەیوەندییەکان گەلێ دەرفەتی نوێی بۆ "پێکهاتن و دەرکەوتنی ئەو شوناسانە کە لە ڕووی خاکەوە سەربەخۆن، ڕەخساندووە و ڕێگای بە گروپە بێ دەوڵەت و هەژارەکان داوە تا خۆیان سەرلەنوێ پێناسە بکەنەوە و ئەو دەوڵەتانە ببەنە ژێر پرسیارەوە کە ئەوانی خستووەتە ژێر دەستی خۆی (٤). دەستڕاگەیشتنی ئاسانتر بە تەکنۆلۆژی چاپ، فۆتۆکۆپی (ئیستینساخ) و بڵاوکردنەوە ڕێگای بە هەموو کەسێک داوە تا کتێب، ڕۆژنامە و هەواڵنامەی خۆی بڵاو بکاتەوە. دەستڕاگەیشتن بە ڕادیۆ، سەتەلایت، تەلەفۆن، ئینتەرنێت، کامێرا، نەواری تەجیل و نەواری ڤیدیۆ ڕێگای بۆ خەڵک خۆش کردووە تا بیروبۆچوونەکانیان لە سەراسەری جیهاندا بڵاو بکەنەوە و تەنانەت بە پێچەوانەی خواستی دەوڵەتانی سەردەست، لەگەڵ خەڵکی دیکەدا پەیوەندی بگرن (٥).

## مەسەلەی کورد

کوردەکان بەگوێرەی پێناسەی هاتچینسۆن[129] و ئیسمیت[130] لە ئەتنیک، گروپێکی ئەتنیکین واتا "کۆمەڵە خەڵکێک کە خاوەن باوباپیری هاوبەش، بیرەوەری مێژوویی هاوبەش و یەک یا چەند تایبەتمەندی کولتووری

---

129- Hutchinson
130- Smith

هاوبەشن و جۆرێک پەیوەندی لەگەڵ نیشتمان و هەستی هاوسۆزی لە نێوان لانیکەم هەندێ لە ئەندامەکانیدا هەی" (٦).

نیشتمانی کورد بە گشتی لە ناو زنجیرە چیاکانی زاگرۆسدایە کە تێیدا سنووری تورکیا، ئێران عێراق و سوریا دەگەنە یەک. زمانی کوردی زمانێکی هند و ئەوروپییە کە پەیوەندی بە زمانی فارسییەوە هەیە. ئەمڕۆ زۆربەی کوردەکان بە دوو زاراوەی سەرەکی (کە بە تەواوی لە یەکدی تێناگەن) واتا سۆرانی و کرمانجی قسە دەکەن. ٧٥ لە ١٠٠ی کوردەکان بە کرمانجی قسە دەکەن و پەیڕەوی ئایینزای شافیعین لە کاتێکدا کە ٢٥ لە ١٠٠ی دیکە لە نێوان موسڵمانی شیعە (١٥%)، عەلەوی، کریستیانی، جولەکە، ئیزەدی و ئەهلی حەقدا (کاکەیی) دابەش کراون (٧). بوونی تایبەتمەندییەکی بەهێزی عەشیرەتی، بیرەوەری هاوبەشی ڕابردوویەکی ڕەوەندایەتی گوندی شاخاوی، ئاگاداربوون لە بوونی وڵاتێک بە ناوی کوردستان (بە واتایەکی دروستتر ئەو ناوچە شاخاوییانە کە باسمانکرد)و دابونەریتی جیاوازی کۆمەڵایەتی لەگەڵ زمان و مێژوو تێکەڵ بووە و کولتوور و مێژووی کوردی پێکهێناوە. ئەم کولتوورە خاڵە جیاواز و یەکگرتووەکانی خۆی بە درێژایی سەدەکان ڕاگرتووە (٨).

سەرلەنوێ دیاریکردنەوەی سنوورە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پاش جەنگی یەکەمی جیهانی کاریگەری یەکجار زۆری کردە سەر کوردەکان. وڵاتی کورد لەو شوێنەدا هەڵکەوتووە کە سنووری تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا بە یەک دەگاتەوە، کەوابوو نفوسی کوردەکان لە نێو ئەم چەند وڵاتەدا بڵاوە و ئەوانی لەناو هەر کام لەم وڵاتانەدا کردووە بە کەمینەیەک (٩). کوردەکان نزیکەی ٢٠ لە ١٠٠ی نفوسی تورکیا، ١٥ لە

۱۰۰ی نفوسی ئێران، ۲۷له ۱۰۰ی نفوسی عێراق و کەمتر لە ۱۰ لە ۱۰۰ نفوسی سوریا پێکدەهێنن (۱۰).

کوردەکان لە هەمووی ئەم چوار وڵاتەدا لە سەدەی ۲۰دا لەگەڵ سیاسەتی بەهێزی ناسیونالیستی، ناوەندچێتی و سەرکوتەکانی دەوڵەتانی تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا ڕووبەڕوو بوونەتەوە کە بۆ تاواندنەوەی کەمینە ئەتنیکییەکانی نە تورک، نە فارس و نە عەرەب بەڕێوە دەچوو. بەهۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری کوردەکان لە هەر کام لەم وڵاتانەدا دەژین، دەوڵەتانی ناوچە وەک هەڕەشەیەک بۆ سیاسەتە نەتەوەسازی و مۆدێرنیزاسیونەکانی خۆیان سەیریان دەکەن (۱۱).

**ئەو فاکتۆرانەی کە گرنگ بوون بۆ ئەوەی ناسیونالیزمی کورد، تەکنۆلۆژی میدیای مۆدێرن بەکار بهێنێت:**

چوار فاکتۆری سەرەکی بووە هۆی ئەوەی کە بزوتنەوەی ناسیونالیستی کورد، تەکنۆلۆژی میدیای مۆدێرن بەکار بهێنێت و ئەنجامەکانی وەدەست بخات:

١- ئەو پارچە پارچەبوونەی خاکی کوردەکان کە باسمانکرد و جیاوازییە زمانیی، کولتووریی و سیاسییەکانی نێوان گروپە کوردەکانی زیاتر کرد.

٢- سەرکوتی کەمینەی ئەتنیکی کورد لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە کە کورد تێیاندا دەژین.

٣- مۆدێرنیزاسیون واتا ئەو ڕەوتە گشتییە کە تێیدا ژمارەیەکی ڕۆژبەڕۆژ زیاتری خەڵک لە شارەکاندا نیشتەجێ بوون و لە شێوە ژیانی

کشتوکاڵی و نەریتی گوندی بڕاون و لەگەڵ بیروبۆچوونگەلی نوێ ڕووبەڕوو بوونەتەوە و لەناکاو کەوتوونەتە ناو ژیانی ڕۆژانەو، سیستمی پەروەردەی حکومەتی دەبینن و کەوتوونەتە ناو ئابووری بازاڕ.

٤- ئاڵوگۆڕەکانی نێو نفوسی کوردەکان، لەوانە بزاڤی پەنابەران، کۆچ و پێکهاتنی کۆمەڵگەی دیاسپۆراکان لە دەرەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

هۆکاری یەکەم و دووەم پێویستی ئەوەی زیاتر کرد کە کوردەکان وەک گروپێک ئیستراتژیگەلێک پەیڕەو بکەن بۆ ئەوەی لە بەرامبەر پارچەپارچەیی و سەرکوتی خۆیان ڕابوەستن. هۆکاری سێیەم و چوارەمیش دەرفەتی ئەوەی بۆ کوردەکان ڕەخساند تا کەڵک لە قازانجەکانی گۆڕانکارییە جیهانییەکان لە بواری تەکنۆلۆژی پەیوەندییەکان و بەجیهانیبووندا وەربگرن.

## پارچەپارچەبوونی کوردەکان

سەرلەنوێ دیاریکردنەوەی نەخشەی سیاسی هەرێمی کوردەکان پاش شەڕی یەکەمی جیهانی بووە هۆی پارچەپارچەبوونی خاکی کورد و پارچەپارچەبوونی خودی کوردەکان لە ڕووی سیاسییەوەو دوای ئەوە جیاوازییە کولتووری و زمانییەکانی نێو کوردەکانی زیاتر کرد: "کوردەکانی عێراق بێ ئەوەی کوردایەتی خۆیان لە دەستبدەن، کەم کەم بوون بە عێراقی و تەنانەت تا ڕادەیەکیش بوون بە بەشێک لە جیهانی عەرەب. کوردەکانی ئێران بوون بە ئێرانی و کوردەکانی تورکیا بوون بە تورکیایی. ئەوە ڕاستە کە ئەو هۆشیارییە بە نیسبەت بوونی شوناسێکی هاوبەشی

کوردی و بیروڕا بەرهەستەکانی بەرژەوەندی هاوبەش قەد لە نێو کوردەکاندا بە تەواوی لە ناو نەچوو، بەڵام درزێکی گەورە کەوتە نێو کولتوور و هەڵوێستی کوردەکان و نەیهێشت کوردەکان کردەوەیەکی هاوبەش ئەنجامبدەن (١٢). کوردە کرمانج زمانەکانی تورکیا (کە نزیکەی ٥٠ لە سەدی کوردەکان پێکدەهێنن) لە ناو قوتابخانە تورکییەکاندا پەروەردە دەکران و بۆ نووسینی کرمانجی لە ئەلفوبێی لاتینی کەڵکیان وەردەگرت، بەڵام کوردە کرمانج و سۆرانی زمانەکانی عێراق، ئێران و سوریا لە قوتابخانەکاندا بە ئەلفوبێی عەرەبی کە ئەلفوبێی ڕەسمی وڵاتەکان بوو پەروەردەیان دەبینی (١٣).

بۆ ناسیونالیستە کوردەکان کە خوازیاری یەکگرتنی کوردەکانن و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە پێویستە یەک زمانی ستانداردی کوردی هەبێت، بارودۆخیکی وەها گیروگرفتی زۆری دروست کرد. جگە لەو گیرو گرفتانەی کە بەهۆی بوونی زاراوە جۆراوجۆرە کوردییەکان دروستبوو (ئەم زاراوانە پەیوەندییان پێکەوە هەیە، بەڵام زۆربەی کوردەکان لە زاراوەی یەکدی تێناگەن)، بوونی سیستمگەلی جیاوازی پەروەردەی دەوڵەتەکان لە ناوچە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کوردە کرمانجەکانی عێراق و سوریا یان ئێران نەتوانن ئەو بەرهەمانە بخوێننەوە کە کوردە کرمانجەکانی تورکیا دەینووسن.

نوخبە ناسیونالیستە کوردەکان هەوڵیان دا بەسەر ئەم جیاوازییانەدا زاڵ ببنەوە، بە تایبەت هەستیان دەکرد کە ئامانجە نەتەوەیەکانیان گرێدراوە بە هەوڵی زیاتر بۆ پێکهێنانی زمانێکی نەتەوەیی و ستاندارد. لێکۆڵەری کورد، ئەمیر حەسەنپوور بە تێروتەسەلی شەواهیدەکانی ئەم

کاریگەرییە دەخاتەڕوو، نموونەکانی سەرنجدانی ڕێبەرانی کورد بە مەسەلەی زمان کە کۆنترینیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٧ باس دەکات و دەڵێت: "ئەحمەدی خانی (ڕۆشنبیرێکی گەورەی کوردی سەدەی ١٧) ئەرکی سیاسی ( پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی) و ئەرکی ئەدەبی (نووسین و تەئلیف بە زمانی کوردی) بە دوو ڕووی یەک سکە دەزانێت. خانی خۆی لە خۆیدا وەک ئامانج سەیری بووژانەوەی زمان ناکات. ئەو سەردەمە زمانێکی ئەدەبی بە پرستیژ لەگەڵ پادشایەکی گەورە نیشانەی سەرەکی نەتەوەی شارستانی و سەربەخۆی کورد بوون" (١٤).

حەسەنپوور هەروەها هەوڵەکانی ڕۆشنبیرانی کورد لە سەدەی ٢٠ شی دەکاتەوە و دەڵێت: "ئەم ڕۆشنبیرانە هەوڵیاندەدا لە ڕێگای ستانداردکردنی زمانی کوردی ئەم زمانە پێشبخەن و بیکەن بە ئامرازێک بۆ پەروەردەیەکی مۆدێرن و پێکهێنانی میدیاکان، ئەدەبیات و کولتوور" (١٥). بەڵام دروست لەو کاتەدا کە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان نەخوێندەوار بوون و ئەمە تەگەرەی بۆ پرۆژە ناسیونالیستییەکانی نوخبە کوردەکان پێش لە دەیەی ١٩٦٠ دروستکردبوو(١٦)، سیستمگەلی جۆراوجۆری نووسینیش گیرو گرفت و تەگەرەیان (بۆ کۆمەڵگەی کورد- وەرگێڕ) دروستدەکرد.

ئەگەر ئێمە هەڵێنجاندنەکەی بێندیکت ئاندیرسۆن[١٣١] قبوڵ بکەین کە دەڵێت بوونی زمانی نووسینی ستاندارد هۆکارێکی زۆر پێویستە بۆ پێکهاتنی کۆمەڵگە نەتەوەییەکان، کەوابوو گرنگی ئەم گیرو گرفتە (لە ناو کوردەکان - وەرگێڕ) نابێت دەستی کەم بگیردرێت. بێندیکت ئاندیرسۆن

---

[131] Benedict Anderson-

دەڵێت: "ئەو کەوسانەی کە بە زمانگەلی فەڕەنسی، ئینگلیزی یا ئیسپانی قسەیان دەکرد و هەستیان دەکرد لە یەکدی بە زەحمەت تێدەگەن و یا قەد تێناگەن، توانییان لە ڕێگای چاپ و کاغەزەوە لە یەکدی تێبگەن. لەم ڕەوتەدا ئەم کەسانە کەم کەم توانییان لە زمانی سەدان هەزار و تەنانەت ملیۆنەها کەس کە بە زمانی تایبەتی خۆیان قسە دەکەن، تێبگەن. (١٧)

لەوانەیە بەهۆی ئەوەی کە لێرە وتمان کە زۆربەی کوردەکان خۆیان بە کورد دەزانن و کەوابوو لە کردەوەدا خاوەن شوناسێکی نەتەوەیین، هەندێ لە خوێنەران لەسەر گرنگی یەکلاییکەرەوەی بوونی زمانێکی ستاندارد و نووسراو بۆ ناسیونالیزمی کورد لەگەڵ ئێمە هاوڕا نەبن. هەروەها ئەو مەسەلەیە جێگای پرسیارە کە یەک زمانی ستانداردی کوردی تا چەند دەتوانێت سەرچاوەکانی دیکەی پارچەپارچەبوونی کوردەکان لە ناو ببات کە بەهۆی جیاوازییە عەشیرەتی، ئاینی، ناوچەیی و جینایەتییەکانەوە دروستبووە (١٨). بەهەرحاڵ ئەوەی کە بۆ ئەم باسەی ئێمە گرنگە، ئەوەیە کە کوردە ناسیونالیست و نوخبەکان لە پێویستی زمانێکی ستانداردی یەکگرتووی کوردی تێگەیشتبوون، چونکە وای بۆ دەچوون کە بوونی ئەم جیاوازییە زمانییە لە سیاسەت و پەروەردەدا زۆر خراپە و بە شوێن ڕێگاچارەکاندا دەگەڕان. کەوابوو چونکە "پێویستی" هۆکاری هەموو داهێنانێکە و کوردەکانیش هەستیان دەکرد کە پێویستە بەسەر ئەم جیاوازییانەدا زاڵ بن، بە دڵنیاییەوە یەکێ لە هۆکارەکانی ئەوەی کە میتۆدی نوێی پەیوەندییەکانیان بەکار هێنا، ئەم پێویستییە بوو.

## سەرکوتی کوردەکان

دەوڵەتی تورکیا، سوریا، ئێران و عێراق زێدەباری سەرکوتکردنی هەموو دەنگەکانی نەیاری خۆیان، کۆمەڵێک بەربەستی توندیشیان لە بەرامبەر کەڵک وەرگرتن لە زمانی کوردی داناوە. تورکیا (هەر چەند کە لە هەندێ ڕووەوە زۆر لە دەوڵەتەکانی دیکە دیموکراتترە) زۆرترین کاری بۆ سەرکوتی دەنگی ناڕەزایەتی کوردەکان و زمان و کولتووری کوردی کردووە:

"سەرهەڵدانی سیستمی دەوڵەت - نەتەوە بەشێوەی ئەورووپایی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە واتای پێشکەوتنی زمانێکی هاوبەش وەک ئامرازێکی گرنگ بۆ مۆدێرنیزاسیۆن و نەتەوەسازی لە ناو کۆمەڵگە چەنە ئەتنیکی و چەند زمانییەکانی ناوچەدا بوو. لە ئەنجامدا، لە ڕێگای کۆمەڵێک سیاسەتی حکومەتی کە لەلایەن تورکیاوە بۆ تێکشکاندنی زمانە غەیرە تورکییەکان پێکەوە دانرابوو، زمانی کوردی بوو بە قوربانی. لە ڕاستیدا مادەی ٢٦ ی یاسای بنەڕەتی ١٩٨٢ی تورکیا کەڵک وەرگرتن لە زمانی کوردی بە هەموو شێوەیەکی لە تورکیا کرد بە سووچ . مادەی ٨٩ دەڵێت: " حیزبە سیاسییەکان ناتوانن بە پێکهێنانی کەمینەگەلێک لە وڵاتی تورکیا لە ڕێگای پاراستن، گەشەپێدانو بڵاوکردنەوەی زمانو کولتووری غەیرە تورکی بە شێوازی نووسینو بڵاوکردنەوەی بەرنامەو پرۆگرام، پەیرەوی ناوخۆ، کۆبوونەوەو پروپاگەندە، یەکێتی نەتەوەیی لاواز بکەن و ناتوانن لە هیچ پلاکارد، زناک، پۆستر، پرۆگرامی تۆمارکراو یان

فیلمو بروشورێک بە زمانی غەیرە تورکی کەڵک وەربگرن یان بڵاوی بکەنەوە. (١٩)

مادەی ٢٦ی ئەم یاسایە لە ڕاستیدا دەڵێت: "هەموو کەسێک مافی ئەوەی هەیە بیروبۆچوونو بیروڕاکانی خۆی لە ڕێگای وتن، نووسین، وێنەو میدیا گشتییەکانی دیکە بە شێوازی تاکی یان گروپی دەربڕێت، بەڵام لە دەربڕینی بیروڕا لە زمانە قەدەغەکراوەکان کەڵک وەرناگیردرێت. بەڵگە دەستنووس یان چاپکراوەکان، وێنەکان، نەوارە موگناتیسی یان ڤیدیۆییەکانو کەرەستەکانی دیکەی دەربڕین ئەگەر دژی یاسابێ بە حوکمی دادوەر و ئەگەر درەنگکردن ببێتە هۆی زەرەر، کتوپڕ لە لایەن کاربەدەستانی پێوەندیداری یاساییەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت". (٢٠)

تورکیا هەرچەند کە ساڵی ١٩٩١ هەندێ لە بەربەستەکانی کەڵک وەرگرتن لە زمانی کوردی هەڵگرت، بەڵام هەروا بە توندی کەڵک وەرگرتن لەم زمانەی سنووردار دەکرد. بۆ نموونە ئەحمەد کایا[١٣٢]، گۆرانیبێژی خۆشەویستی کورد کە بۆ ساڵەهای ساڵ لە تورکیا گۆرانی دەگوت، پاش ئەوە کە ڕایگەیاند کە بە کوردی گۆرانی دەڵێت دەستگیر کراو تۆمەتی ئەنجامدانی پڕوپاگەندەی جیاییخوازانەی خرایە پاڵ (٢١). عەباس وەلی[١٣٣] ئەوە زیاد دەکات کە " لە دیموکراسی تورکیادا ڕێگا بە دەربڕینی دەنگی ناڕەزایەتی کورد نادرێت و وەک خیانەت لە قەڵەم دەدرێت، کەوابوو ئەم ناڕەزایەتییە بەشێوەی نهێنی و چەکداری دەردەبڕدرێت. هەر بۆیە ئۆپۆزیسیۆنی چەکداری دژی دەوڵەت لە پارێزگا کوردنشینەکانی باشووری

---

Ahmet Kaya-[132]

Abbas Vali-[133]

ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە لایەن پارتی کرێکارانی کوردستان (پ ک ک )وە بەڕێکخستن کرا و ڕێبەرایەتی کرا" (٢٢).

عەباس وەلی دەڵێت: کە داخستنی هەموو کەناڵە فەرمییەکان بە ڕووی دەربڕینی دەنگی نارەزایەتی کوردەکان لە تورکیا، بووەتە هۆی ئەوەی کە پەیڕەوکردنی ڕێگاگەلی نایاسایی توندوتیژانە (لە لایەن PKK وە) ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت، هەمان شتیش بووەتە هۆی ئەوەی کە (بزوتنەوەی) ناسیونالیستی ئەتنیکی کورد ڕوو لە تەکنۆلۆژی پەیوەندییەکان بکات: لە چوارچێوەی سەرکوتی کورد لە تورکیا دا، هەر چەشنە کەڵک وەرگرتنێک لەم زمانە وەک دەربڕینی دەنگی نارەزایەتی لە قەڵەم دەدرێت. کوردەکان لە ڕووی یاساییەوە لە دەستڕاگەیشتن بە پەروەردە، چاپ، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن لە وڵاتی خۆیان بێبەشن، کەوابوو ناچارن هەوڵبدەن لە وڵاتانی دیکە دەستیان بەم سەرچاوانە بگات (٢٣).

لەوانەیە زۆر جێگای سەرسوڕمان نەبێت کە گرنگترین هۆکارێک کە بووە هۆی ئەوەی کە کوردەکان هەنگاو بۆ دۆزینەوەی ڕێگاگەلی دیکە بۆ دەربڕینی دەنگی خۆیان واتا دامەزراندنی MED TV هەڵگرن، ئەو بەربەستە زۆر توندانە بوو کە دەوڵەت لە بەرامبەر زمان، کولتوور و پەیوەندییەکانی کوردەکاندا داینابوو. لە بنەڕەتدا گروپێک لە ڕۆشنبیرانی کورد کە زۆرتر خەڵکی تورکیا بوون، "MED TV"یان دامەزراند.

لە ئێران، عێراق و سوریا سەرکوتی حکومەت زۆرتر بە ئامانجی سەرکوتکردنی دەنگی نارەزایەتی سیاسی کورد دەکرا تا لە ناوبردنی زمان و کولتووری کورد. پاوانکردنی کەناڵەکانی سیاسی زانیاری و پەیوەندییەکان لە لایەن ئەم حکومەتانەوە پاڵی بە ناسیونالیستە

کوردەکانەوە نا تا هەوڵبدەن بەشوێن کۆمەڵێک ئامرازی دیکەدا بگەڕێن، بۆ ئەوەی بەسەر ئەم باڵادەستییەی حکومەت بەسەر کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا زاڵ بن. بەڵام پێش ئەوەی باسی رووهێنانی کوردەکان بە وەرگرتنی تەکنۆلۆژی پەیوەندییە نوێکان بکەین، دەبێ ئەو فاکتۆرانە بخەینە بەر باس کە وای لە کوردەکان کرد بتوانن لەم تەکنۆلۆژییە کەڵک وەربگرن .

هەتا دەیەی ۱۹۵۰ کۆمەڵگە و ئابووری کورد هێشتا زۆرتر نەریتی بوو، شێوەی کشتوکاڵی فیودالی زاڵ بوو(٢٤). بە دروستبوونی چینێکی ناوەڕاستی ڕۆشنبیری تا ڕادەیەک بچووک کە بووە ڕێپیشاندەر بۆ ئەو خەڵکە، کە بە دەستی هەژاریی و نەخوێندەوارییەوە دەیانناڵاند، کوردەکان وەک گروپێک حەزیان دەکرد بکەونە ناو بزاڤی بەکارهێنانی تەکنۆلۆژی میدیای پەیوەندییەکان. بەهەرحاڵ مۆدێرنیتە کۆمەڵێک ئاڵوگۆڕی دروستکرد، کە هەم لە ڕووی چەندایەتی و هەم لە ڕووی چۆنایەتییەوە چینی ڕۆشنبیری کوردی گەورە کرد و ئاستی خوێندەواری خەڵکی بە گشتی بردە سەرەوە و بوارێکی سیاسی گەورەتری لە ناوچە بۆیان ڕەخساند.

لە دەیەی ۱۹۵۰ کۆمەڵێک ئاڵوگۆڕی گرنگ لە شێوەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی نەریتی دەستی پێکرد کە بەشێکی بەهۆی ئەو ڕاپەڕینە جوتیاریانەو (لە ئەنجامدا کۆچی جوتیاران لەم ناوچانە) و چاکسازی لە زەویدا بوو کە حکومەت ئەنجامیدا. کۆچی گوندنشینان بەرەو شار زیادی کرد و چینی کرێکار و بۆرژوازی کورد دەستی بە گەشە کرد. کرێکاران و کۆچبەرانی کورد لە شارە گەورەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا (شارگەلێک

وەک ئانکارا، ئیستانبول، بەغداد، دیمەشق، تاران و ئەسفەهان) نیشتەجێ بوون. ژمارەیەکی زیاتر لە کوردەکان ڕوویان هێنایە کاری پیشەیی و هونەریی و بوون بە خاوەن پیشە و ژمارەیەکی زیاتری کوردەکان بوون بە میکانیک (فیتەر)، چاپکار، وایەرمەن، پارێزەر، پزیشک و ڕۆژنامەنووس. زیادبوونی ڕێژەی پەروەردە بواری بۆ بەشداریکردنی کوردەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی و کولتووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خۆشکرد (٢٥).

ئەم ڕەوتی مۆدێرنیتەیە نفوسێکی کوردی دروستکرد کە تینووی ئەو زانیارییانە بوو کە پەیوەندی بەو مەسەلانەوە هەبوو کە کاریگەری لەسەر ژیانیان دادەنا. هەروەها بواری ئەوەی بۆ بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد خۆشکرد کە دەستی بگات بە پیشەگەلێکی پرۆفیشناڵ وەک ڕۆژنامەنووس، تکنیسییەن و کارسازی ئابووری (٢٦). لە باکووری عێراق کە لە کۆتایی شەڕی کەنداو لە ١٩٩١ تا ئێستا لەژێر دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی کورددایە، کوردەکان دەستیان بەسەر ئێزگەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و چاپخانەکانی دەوڵەتدا گرت و دەستیانکرد بە کاری ڕاگەیاندن بۆ بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد وەک پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK)و یەکێتی نیشتمانی کوردستان .(PUK)کوردەکانی تورکیا، سوریا و ئێران دەرفەتێکی وایان بۆ نەڕەخسا، هەر چەند کە توانییان لە دەرەوەی وڵات، بە تایبەت لە لایەن دیاسپۆرای کورد لە ئەورووپا سەرچاوەکانی دیکەی شکاندنی پاوانی دەوڵەت بەسەر زانیارییەکاندا دروست بکەن.

## گۆڕانکارییەکانی حەشیمەتی کورد و پێکهاتنی کۆمەڵگەی دیاسپۆرا

زێدەباری بەدەستهێنانی پەروەردە و شارەزایی نوێ، ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکان کە لە شارە گەورە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نیشتەجێبوون، لەگەڵ ئیدۆلۆژیگەلی نوێ ڕووبەڕووبوونەوە و گەلێکیان چوونە ناو بزوتنەوە ئۆپۆزیسیۆنە (موعارەزە) چەپەکانی ئێران، عێراق، سوریا و تورکیا، بەڵام بەهەرحاڵ کاتێ کە ئەم ڕێکخراوانە لە دانپێدانان بە مافە سیاسییە نەتەوەییەکانی کوردەکان سەرپێچییان کرد، گەلێک لە کوردەکان لەم ڕێکخراوانە کشانەوەو هەوڵیاندا بزوتنەوەی کوردی ئۆپۆزیسیۆنی تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن. پارتی کرێکارانی کوردستان (PKK) لە تورکیا بەم شێوەیە دامەزرا (٢٧).

بەتایبەت لە تورکیا سیاسەتەکانی حکومەت بۆ تاواندنەوەی ئەو کوردانەی کە بۆ ناوچە غەیرە کوردنشینەکان گوازراونەتەوە، سەرکەوتوو بووە و ئەم خەڵکە ئیدی قەد خۆیان بە کورد نازانن، هەرچەند کە هەندێکیان هەندێ هەستی کوردایەتییان تێدا ماوە، بەڵام بەهەرحاڵ وەک زمانی یەکەم لە باتی کوردی بە تورکی قسە دەکەن. کوردە ناسیونالیستەکان کە لەم ڕەوتانە زۆر نیگەران و تورە بوون، گرنگی زۆریاندا بە شکاندنی پاوانی دەوڵەت بەسەر تۆڕی زانیارییەکان و پەیوەندییەکانداو زیندووکردنەوەی زمان و هۆشیارییە ئەتنیکییەکانی کوردەکان. بزوتنەوەگەلێک وەک PKK سەریانهەڵدا و سیاسەتەکانی دەوڵەت بەنیسبەت کەمینەی کوردیان بردە ژێر پرسیار (٢٨). بەهەرحاڵ پێکهاتنی کۆمەڵگەگەلی کوردی تا ڕادەیەک گەورە، بە تایبەت لە ئەوروپا بوارێکی

دیکەیان بۆ ڕێبەرانی نەتەوەیی کورد ڕەخساند تا لەم ڕێگایەوە پاوانی دەوڵەت بەسەر پەیوەندییەکاندا ببەنە ژێر پرسیار.

تێکەڵبوونی ئەم کێشە ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییانە، کوردەکانی بە کۆمەڵ ناچار کرد تا پەنا ببەنە ناو ناوچەکانی دەرەوەی هەرێمی خۆیان (زۆرتر وڵاتانی ئەورووپایی) (٢٩) . ئازادی ڕادەربڕین لە ئەورووپا دەرفەتی پەروەردە، بڵاوکردنەوە و پەیوەندیگرتنی بۆ کوردەکان بەو جۆرە کە ئارەزوویان دەکرد، ڕەخساند (٣٠). گەورەیی کۆمەڵگەی دیاسپۆرای کورد (نزیکەی ٨٠٠ هەزار کەس) (٣١) وایکرد کە چاپ و بڵاوکردنەوە، پەروەردە و پەخشی بەرنامە لە ڕووی ئابوورییەوە بە قازانج بێت. داهاتی بەرز لە ڕۆژئاواش بواری ئەوەی بۆیان ڕەخساند تا لەسەر تەکنۆلۆژی مۆدێرنی پەیوەندییەکان سەرمایەگوزاری بکەن و پێیبگەن.

بەهەرحاڵ ئەوە گرنگە کە کۆمەڵگەی دیاسپۆرای کورد هێشتا لەگەڵ کوردەکانی ناوخۆی کوردستان پەیوەندی هەیە و پەیوەندی گروپە کوردەکان لەگەڵ (کوردستان - وەرگێڕ) کاریگەری لەسەر دەوڵەتی تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا داناوە (٣٢) .

## ئیستراتیژی کورد بۆ تیکەڵبوون بە پەیوەندییە مۆدێرنەکان

"تەکنۆلۆژی نوێی پەیوەندییەکان نەک تەنها چەمکی یەکپارچەیی کەمڕەنگ کردووە، بەڵکو کەشوهەوایەکی نوێی بۆ گروپە پەراوێزخراوەکان ڕەخساندووە تا بەسەر ئەو پارچە پارچەبوونەدا زاڵ بن کە دەوڵەت-نەتەوەکان بە سەریاندا سەپاندوویانە" (٣٣). بڵاوکردنەوەی وێنە و ڤیدوئۆی نهێنی سەبارەت بە سەرکوتی دەوڵەتەکان یارمەتی بە

سیاسیبوون، تەیاربوون و یەکگرتنی بزوتنەوە ئۆپۆزیسیۆنەکان دەدات .
لە جیهانی گلوبالیزەدا بەڵگە دەربارەی سەرکوتی دەوڵەت دەبێتە هۆی ئەوەی کە گروپەکانی دیکەش، وەک خەڵکان و دەوڵەتانی دۆستی بزوتنەوەکە، گروپەکانی مافی مرۆڤ ، کۆڕە نێونەتەوەییەکان و ڕێکخراوە دەوڵەتییەکانی دیکەش پشتیوانی لە گروپی سەرکوتکراو بکەن .

خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە پاوانی دەوڵەت بە سەر زانیارییەکان و ڕاگەیاندن شکا. لە باکووری عێراق کە ئێستا لەژێر کۆنترۆڵی کوردەکاندایە، لە کاتی ڕاپەڕینی پاش شەڕی کەنداو لە بیناکانی ئیستیخباراتی عێراقدا دەست بەسەر شریتە ڤیدیۆییەکاندا گیرا (بۆ نیشاندانی بەڵگەمەندی ئەشکەنجە و لەسێدارەدانی کوردەکان بە دەستی دەوڵەتی عێراق). یەکێ لەو شریتانەی کە خەڵک زۆر حەزی لێیە ناوی "جینایەتەکانی سەدام "ـە. فرۆشیاری کوردی ئەم نەوارە دەیگوت: "لەوانەیە هەندێ خەڵک حەون بە "ڕامبۆ"وە ببینن، بەڵام ئەگەر دەربارەی هەر کام لە بەشەکانی شریتی "جینایەتەکانی سەدام" پرسیاریان لێبکرێت هەموو شتەکانی شریتەکەت بە وردی بۆ دەگێڕنەوە". ئەو ئێزگە تەلەفزیۆنە محەللییانە کە لە ڕاپەڕیندا دەستی بەسەردا گیرا، ئێستا کوردەکان کەڵکی لێوەردەگرن و تێیاندا ئەو تەوەرانە کە لە کاتی دەسەڵاتی دەوڵەتدا قەدەغە بوو، باس دەکرێت و بەرنامەی لەسەر بڵاو دەکرێتەوە. کوردەکان لەم ئێزگانەدا ستایشی مێژوو و قارەمانەکانی خۆیان دەکەن. هەروەها شریتی ڤیدیۆ بە پرۆگرامی بیانی بۆ ناوچە قاچاغ دەکرێت و ئەمەش پاوانی حکومەتی عێراق بەسەر زانیارییەکانی شکاندووە (٣٤) .

له تورکیا PKK شریتی هێرشەکانی خۆی بۆ سەر مۆڵگەکانی هێزەکانی تورکیا و چالاکییەکانی گەریلاکان و ژیانیان بە قاچاغ دەباتە ناو خەڵک.
PKKهەروەها شریتی کردەوە دڵڕەقانەکانی تورکیا بە قاچاغ لە ناو خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە بەو ئامانجەی کە پشتیوانی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت و پشتیوانی زیاتری کوردەکان لە دەرەوە تەیار بکات.

کۆمەڵگەی دیاسپۆرای کوردیش کەڵکی تەواوی لە قازانجەکانی تەکنۆلۆژی پەیوەندییەکان وەرگرتووە بۆ ئەوەی کولتوور و زمانی، لە بن هەڕەشەی خۆیان بپوژێننەوە. کوردەکان لە ئەورووپا کەڵک لە ئامرازە ئەلیکترۆنییەکان وەردەگرن بۆ ئەوەی لە بەرامبەر سانسۆری بابەتە کوردییەکان لە لایەن دەوڵەتەکانەوە ڕابوەستن. نووسەرانی کورد لە دەرەوەی وڵات یارمەتی سەرەکییان. بە پێشکەوتنی زاراوەی ستانداردی نووسراوی کرمانجی و هەروەها زیادبوونی بەرهەمە ئەدەبییەکان داوە. گەلێ لە دەقە کرمانجییەکان کە لە سوید و فەڕەنسە بڵاو دەبنەوە کە بابەتەکانیان لە ڕێزمان و فەرهەنگ بگرە تا چیرۆک و بابەتی ڕۆژنامەوانی هەمەڕەنگە، دیسان لە تورکیا بڵاودەبنەوە (٣٥). ڕۆژنامەگەلی لایەنگری کوردەکان وەک OZGUR POLITIKA کە لە تورکیا قەدەغەیە، لە ئەورووپا بڵاو دەبێتەوە و بە قاچاغ دەبرێتە ناوچە کوردنشینەکان.

ڕۆژنامەی OZGUR POLITIKA و بەرهەمەکانی دیکەی نەیاری حکومەت ڕاستەوخۆ لە ناو ئینتەرنێتدا بڵاو دەبێتەوە و دەکەوێتە بەردەستی خوێنەرانی لە ناوچەی کوردنشین. پێش لە ساڵی ١٩٩٥ ژمارەی ماڵپەڕە کوردییەکان کەمتر لە ٢٠ ماڵپەڕ بوو، بەڵام لە ژانویەی ساڵی ٢٠٠١ دا

ئەگەر لەناو ئینتەرنێتدا بە شوێن وشەی "کورد"دا بگەڕای، زیاتر لە ٢٩٤٦٣ سەرچاوەت دەدۆزییەوە کە ٧٥ لە ١٠٠ی زانیارییە یەکەمەکان دەربارەی وتاری دەنگوباس یان ماڵپەڕە کوردییەکان بوو، هەروەها ٢٣٩٧٢ سەرچاوەی دەچووە ناو ئەو وێبلاپەڕانەی کە پەیوەندییان بە بابەتی کوردەوە هەبوو. ماڵپەڕگەلێک وەک " KURD.COM " و " KURDISH.COMهەر کامیان سەدان لینکیان بۆ ماڵپەڕە کوردییەکانی دیکە تێدابوو، کە ئەم ماڵپەڕانەش بابەتیان بە زمانی ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەرەنسی و تورکی و زاراوەی کرمانجی، سۆرانی و زازاییان تێدابوو(٣٦) .

EMAIL ئامرازێکی هەرزانە کە بە زەحمەت کۆنترۆڵ دەکرێت و زۆر کەس دەتوانێت دەستی پێڕا بگات بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕا و بڵاوکردنەوەی زانیاری و بەرێکخستنکردنی پرۆژە ناسیونالیستییە ئەتنیکییەکان لە سەراسەری جیهاندا. ئینتەرنێت وەک گۆڕەپانێک بۆ باس و گفتوگۆ و موناقەشە دەربارەی بابەتە قەدەغەکراوەکان کەڵکی لێ وەردەگیرێت(٣٧). پەیوەندییە ئەلیکترۆنییەکان لە شێوەکانی دیکەی پەیوەندی وەک دەزگاکانی چاپ ئاسانتر و هەرزانترە. The Spirit Arm کە ڕێکخراوێکی دژە ئیمپیریالیستی کەنەداییە و زانیاری دەربارەی کورد و بابەتەکانی دیکە بڵاو دەکاتەوەو دەڵێت: "گروپی ئێمە ساڵی ١٩٩٥ دەستی بە بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی KURD- L کرد، ئەو کاتە گروپی چەپ یا گروپی کوردی زۆر کەم لە ناو ئینتەرنێتدا چالاک بوون" (٣٨).

بەهەرحاڵ زۆربەی ئەو کوردانەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەژین هێشتا بە گشتی دەستیان بە سەرچاوەکانی ئینتەرنێت ناگات و ئەو باس

و گفتوگۆ، دەنگوباس و زانیارییانە کە لە ئینتەرنێتدا بڵاو دەبێتەوە، بە شێوەگەلی ناڕاستەوخۆ دەچێتە ناو کۆمەڵگەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

یەکێ لە ئامرازەکانی دیکەی پەیوەندییەکان کە لە دەستی کۆمەڵگەی دیاسپۆرای کورددایە و کاریگەری یەکجار زۆری لەسەر کۆمەڵگەی کورد لە ناوخۆی وڵاتدا داناوە، MED TVیە کە ئیزگەی سەتەلایتێکی کوردییە کە شوێنە سەرەکییەکەی لە بەلژیکا و لەندەنە. کوردەکان بە دامەزراندنی MED TVبوون بە یەکێ لە یەکەم نەتەوەکانی بێ دەوڵەتی خاوەن تەلەفزیۆن لە جیهاندا (٣٩). دامەزرێنەری سەرەکی ئەم ئیزگەیە کوردێکی خەڵکی تورکیا بە ناوی حیکمەت تەبەق[١٣٤] بوو کە ساڵی ١٩٩٢ ناوچەی خۆیانی لەسەر سنووری تورکیا و ئەرمەنستان بە جێهێشتبوو و بەریتانیا مافی پەنابەری پێدابوو.

حیکمەت تەبەق و ٢٠ کەسی دیکە MED TV یان لە ساڵی ١٩٩٤ دامەزراند. ئەم گروپە تەنها ٥ هەزار دۆلار پارەی هەبوو و لە ناویاندا حیکمەت تەبەق (کە شاعیر، نووسەر و فیلمساز بوو) تەنها کەسێک بوو کە تۆزێک تەجروبەی بەڕێوەبردنی ئیزگەیەکی تەلەفزیۆنی هەبوو، و ژمارەی بەڕێوەبەران و ڕۆژنامەنووسانی کوردی شارەزای کاری تەلەفزیۆن زۆر کەم بوو. حیکمەت تەبەق دەڵێت: "بەڵام ئێمە دەمانبینی کە کۆمەڵگەکەمان هێدی هێدی بەرەو لەناوچوون دەچێت و هەستماندەکرد دەبێ کارێک بۆ ڕاوەستاندنی ئەم ڕەوتی بەرەوپاشچوونە ئەنجام بدەین"، کەوابوو بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیمان لەگەڵ کۆمپانیای BRITISH TELECOMگرت (٤٠).

---

[134] Hikmet Tabak-

MED TV ئامرازی ئەوەی بۆ کوردەکان ڕەخساند تا لە بەرامبەر هێزی یەکجار زۆری دەوڵەتەکان بۆ زاڵبوون بە سەر تۆڕی زانیارییەکاندا ڕابوەستن. ئەمیر حەسەنپوور دەڵێت:

MED TV"ئەو سنوورە نێونەتەوەییانەی دەرباز کرد کە لە ١٩١٨ەوە خاکی کوردستانی دابەش کردبوو، بۆ یەکەمجار لە مێژوودا دەرفەتی ئەوە بۆ کورد رەخسا تا ئامرازێکی بەهێزی پەیوەندییەکان لە نێو خۆیدا دابمەزرێنێت و ئەو بیچیمە ژیوپلوتیکییە[١٣٥] دەوڵەتییە سست بکات کە کوردی کردبوو بە کەمینەیەکی هەژاری بێکەس. گەلی کورد بۆ یەکەمجار لە مێژووی دابەشکراوی خۆیدا ئێستا دەتوانێت ژیانی خۆی، ڕاستییەکانی خۆی لەسەر شاشەی ئەم تەلەفزیۆنە لە سەراسەری جیهاندا ببینێت. کوردەکانی ئێران دەتوانن لەسەر هێڵی تەلەفۆن لەگەڵ کوردەکانی تورکیا قسە بکەن و کوردەکانی عێراق دەتوانن ببینن کە کوردەکان چۆن لە ئەوروپا دەژین. هەموو شەوێک بە ماوەی چەند کاتژمێر گەورەترین نەتەوەی بێ دەوڵەتی جیهان ماڵێکی بۆ خۆی هەیە" (٤١).

MED TV زیاتر لە هەر شتێکی دیکە هۆشیارییە ئەتنیکییەکانی لە نێو کوردەکان لە سەدەی ٢١دا هان داوە و بەرنامەکانی زۆرترین بینەری لە نێو کوردەکانی سەراسەری جیهاندا هەیە. لەساڵی ١٩٩٥ەوە ژمارەی ساجەکانی سەتەلایت لەسەر بانی ماڵەکان لە گەلێ لە شارەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا زیادی کردووە (٤٢). خەڵکی دیاربەکر (گەورەترین شاری کوردنشینی جیهان هەڵکەوتوو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا) و سەراسەری کوردستان بە نووسەری ئەم وتارەیان دەگوت: "هەموو کەس

---

geopolitical order-[135]

سەیری MED TV دەکات و ئەگەر خۆشیان سەتەلایتیان نەبێت دەچنە ماڵی کەسێکی دیکە یا قاوەخانەیەک تا سەیری بکەن(٤٣). " گەلێ لە بنەماڵە جوتیار و گوندییەکانی کوردستان تەنانەت ئۆتۆمۆبێل و هەموو مەڕوماڵاتی خۆیان فرۆشتووە بۆ ئەوەی سەتەلایتێکی پێبکڕن و لەوانەیە بۆ ئەمەش لەگەڵ مەترسی هێزەکانی ئاسایش لە ناوچەی خۆیان ڕووبەڕوو ببنەوە" (٤٤).

بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکانی خودی دەوڵەتی تورکیا، نزیکەی ٩٠ لە ١٠٠ی خەڵکی ناوچەی کوردنشینی تورکیا سەیری کەناڵی MED TV دەکەن. ئەمیر حەسەنپوور دەڵێت: "تەنانەت قورروجییەکان (گوندپارێزەکان) واتا ئەو هێزانەی کە بەکرێگیراوی حکومەتن تا دژی PKK شەڕ بکەن و هەروەها ئاوارەکانی شەڕ کە لە کەلاوەکانی شارەکانی ڕۆژئاوای تورکیا نیشتەجێن، لە دەوری یەک کۆ دەبنەوە تا سەیری MED TVی بکەن" (٤٥).

بەرنامەکانی MED TV لە دەنگوباس و بەرنامەی سیاسی بگرە تا بەرنامەی منداڵان و مۆسیقا و دراما و بەرنامەی داکیومینتاری (بەڵگەمەند) هەمەچەشنەیە و زۆرتر بە زاراوەی کرمانجی و هەروەها بە زاراوەی سۆرانی و زازایی و زمانی فارسی، ئارامی و عەرەبی بەرنامە بڵاو دەکاتەوە. MED TV نەتەنها بە پەخشی بەرنامە بە زمانی کوردی یاساکانی تورکیا دەباتە ژێر پرسیارەوە، بەڵکو لێکدانەوە ڕەسمییەکانی دەوڵەت دەربارەی ڕووداوەکان و مەسەلە سیاسییەکان دەباتە ژێر پرسیار، چونکە هەواڵی تایبەت بەخۆی بڵاو دەکاتەوە و بەرنامەی گفتوگۆ و باسی سیاسی لەسەر ئەو بابەتانە کە بۆ دەوڵەتەکان بە تەواوی قەدەغەیە (وەک بانگەشەکانی کوردەکان لەسەر مافی چارەی خۆنووسین) پەخشدەکات.

کەوابوو کاریگەری MED TV نابێت دەستی کەم بگیردرێت، چونکە ئامرازی تەلەفزیۆن لە ئامرازەکانی دیکەی ڕاگەیاندن وەک ڕادیۆ و چاپەمەنی بەهێزترە و دەتوانێت سنووری نەخوێندەواری، زمان، ناوچە، تەمەن، جیندەر (جنسی ژن و پیاو) و ئایین دەرباز بکات" (٤٦).

ئەگەر دەوڵەتی تورکیا ئیزنی بە کوردەکان بدایا تا میدیایەکیان بە زمانی خۆیان هەبێت، ئیزگەیەک وەک MED TV دەیتوانی لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵی تورکیا پێشبکەوێت (٤٧). بەهەرحاڵ ڕۆشنبیرانی کورد هیچ ڕێگایەکی دیکەیان نییە جگە لەوە کە میدیای سەربەخۆی خۆیان لە ئەوروپا بدۆزنەوە، چونکە لە ئەوروپا ئازادی ڕادەربڕین زیاترە. لە ڕاستیدا تورکیا باش دەزانێت کە MED TV چی دەورێکی لە هاندانی ناسیونالیزمی کورددا هەیە، هەربۆیە هەوڵیداوە تا پێش لە گەیشتنی دەنگی ئەم تەلەفزیۆنە بگرێت. هێزەکانی ئاسایشی تورکیا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا ساجی سەتەلایتەکان دەشکێنن و خاوەنی ساجەکان دەستگیر دەکەن (٤٨).

دەوڵەتی تورکیا هەنگاوی دیپلۆماتیکی زۆری هەڵگرتووە تا مۆڵەتی ئەم ئیزگەیە لە لەندەن و بەلژیکا هەڵبوەشێنێتەوە و لەم پەیوەندییەدا گوشاری خستووەتە سەر کۆمپانیاگەلێک وەک FRANCE TELECOM تا مۆڵەتەکەی MED TV تازە نەکەنەوە و لەم کارەشدا سەرکەوتوو بووە (٤٩). تورکیا هەروەها گوشاری خستووەتە سەر کەرتی تایبەت تا لەگەڵ MED TVمامەڵە نەکەن، کەوابوو لە ئەنجامدا گەلێ لە بانکەکان، دامەزراوە یاساییەکان و دامەزراوە بازرگانییەکانی دیکە لەگەڵ ئەم ئیزگە کوردییە

مامەڵە ناکەن، چونکە لەوە دەترسن کە تورکیا بۆ کاری بازرگانی ڕێککەوتنیان لە گەڵ مۆر نەکات (٥٠).

MED TV بۆ گەلانی بێ دەوڵەتی دیکەی جیهانیش بووە بە نموونە و سەرچاوەی ئیلهام وەرگرتن. نوێنەری پەنجابیەکان، تامیلەکان و تەنانەت ئەرمەنییەکانیش نزیکی MED TV بوونەتەوە و پرس و ڕای لەگەڵ دەکەن و داوای لێدەکەن کە بەرنامەکانیان لەم تەلەفزیۆنەدا بڵاو بکەنەوە. بەهەرحاڵ تا ئێستا هیچ پرۆژەیەکی هاوکاری لە نێو ئەم گروپانە و MED TVدا جێبەجێ نەبووە و هۆکاری ئەمەش زۆرتر ئەوەبوو کە MED TV لەوە نیگەران بوو کە بەهۆی هاوکاری لەگەڵ ئەم گروپانە بچێتە ژێر پرسیار، چونکە سیستمی ئیداری بەریتانیا زۆر بە وردی چاودێری بارودۆخەکەی دەکرد (٥١).

لە ٣ی ئاڤریلی ١٩٩٩ کۆمیسیۆنی سەربەخۆی تەلەفزیۆنی بەریتانیا (ITC)مۆڵەتیMED TVی هەڵوەشاندەوە (ITC). سەرەنجام تەسلیمی بانگەشەکانی تورکیا بوو دەربارەی ئەوە کە MED TV کوردەکانی تورکیا بۆ توندوتیژی هان دەدات و بۆ داخستنی ئەم ئیزگەیە ئەو پاساوەی هێنایەوە کە: "هەرچەندە لەوانەیە هاوسۆزی لەگەڵ گەلی کورد لە بەریتانیادا هەبێت، بەڵام لە بەرژەوەندی گشتی (ئێمەدا- وەرگێڕ) نییە کە دەزگایەکی ڕاگەیاندن لە بەریتانیا وەک سەکۆیەک بۆ هاندانی خەڵک بۆ توندوتیژی کەڵک وەربگرێت" (٥٢).

بەهەرحاڵ تا جولای ١٩٩٩ ئیزگەیەکی سەتەلایتی نوێ بە ناوی MEDYA TVلە فەرەنسا مۆڵەتی وەرگرت. MEDYA TV بە گشتی وەک میراتی MED TV سەیر دەکرا و لە لایەن هەمان کارمەندانی MED TV یەوە

بەڕێوە دەچوو، لەگەڵ هەوڵەکانی دەوڵەتی تورکیا بۆ بێدەنگکردنی میدیایەکی سەربەخۆی کورد ڕووبەڕوو بووەوە. بەهەرحاڵ ئێزگەیەکی تەلەفزیۆنی کولتووری(CTV )یش لە لایەن بەریتانیاوە ڕێگای پێدرا تا ڕۆژی چەند کاتژمێر بەرنامەی کولتوری بە زمانی کوردی بڵاو بکاتەوە. هەوڵەکانی دەوڵەتی تورکیا بۆ بێدەنگکردنی کوردەکان و بێبەشکردنیان لە دەستڕاگەیشتن بە قازانجەکانی میدیاکان تەنها نەبووە هۆی بێدەنگ بوونیان بەڵکو دەنگی کوردەکانی زیاتر و چەند قاتتر کرد.

هەوڵەکانی تورکیا بۆ بێدەنگکردنی MEDYA TV تەنها بە ئەورووپا سنووردار نەبوو(٥٣). تورکیا لەم پێناوەدا یارمەتی بە حیزبە کوردەکانی کوردستانی عێراق دا تا تەلەفزیۆنی خۆیان واتا تەلەفزیۆنێکی دژی PKK دابمەزرێنن(٥٤)، بە واتایەکی دیکە تورکیا هەوڵیدەدا "شەڕی ئاگر بە ئاگر بکات" (٥٥). دامەزرێنەری MED TV ، حیکمەت تەبەق لە ڕاستیدا لەم مەسەلەیە خۆشحاڵ بوو و دەیگوت: "ئێزگە کوردییەکانی دیکە هەر چی دژی MED TV دەڵێن با بیڵێن، گرنگ نییە، مادام کە بە زمانی کوردی دژایەتیمان دەکەن، شتێکی باشە. تورکەکان بە ڕێگادان بەم کارە، یاساکانی خۆیان دەشکێنن" (٥٦). بەهەرحاڵ لەوە بە دوا دەوڵەتی تورکیا بەشێوەی غەیرە فەرمی دانی بەوەدا نا کە ناتوانێت پێش لە بڵاوبوونەوەی بەرنامەکانی ئەم سەتەلایتە کوردییە بگرێت.

کەوابوو تەکنۆلۆژی پەیوەندییەکان، بە تایبەت MED TV دەورێکی گەورەیان لە زەقکردنەوەی هۆشیارییە ئەتنیکییەکانی کوردەکان، بە سیاسیبوونی ئەتنیکەیان و تەنانەت یەکگرتوویی ئەتنیکی کوردەکاندا

گێڕاوە (٥٧). ئەو کەسانە کە MED TV یان دامەزراند و بەڕێوەیان دەبرد دەربارەی دەوری ئەم ئێزگەیە ڕاشکاوانە دەیانگوت:

MED TV "بەو هیوایە دامەزرا کە یارمەتی بە بووژانەوەی زمانی کوردی و شوناسی نەتەوەی بێکەس و هەژاری کورد بدات و زانیاری دەربارەی ڕووداوە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان بدات بە کوردەکانی سەراسەری جیهان. " (٥٨)

حیکمەت تەبەق دەیگوت: "ئێزگەی MED TV هێزی متمانە بەخۆکردنی زۆری بە کوردەکان بەخشی، پێشتر کوردەکان هەستیان دەکرد ناتوانن هیچ شتێک بکەن، بەڵام MED TV هەموو سنوورەکانی دەرباز کرد و کوردەکانی وڵاتە جۆراوجۆرەکانی بە یەکتر ناساند. پێشتر تەنها قاچاخچییەکان چاپەمەنی کوردیان دەبردە ناو ناوچە کوردنشینەکان. MED TV وای لە کوردەکان کرد کە لە یەکدی تێبگەن و پەیوەندییەکی لە نێوان زاراوە کوردییەکاندا دروستکرد و خەڵکی فێری زاراوە و ئایینزاگەلی جۆراوجۆر کرد. ئاڵوگۆڕی پەیوەندییەکان لە نێوان کوردەکان لە ئاستی سیاسیشدا شتێکی زۆر گرنگە و MED TV گۆڕەپانێکە بۆ دەربڕینی دوو لایەنەی بیروڕاکان و توانیویەتی ئەم ئەرکە بە باشی جێبەجێ بکات. MED TV لانیکەم کوردەکانی لە سەر شاشەکان پێکەوە یەکگرتوو کرد. لە ڕاستیدا MED TV شۆڕشێکی گەورە بۆ یەکگرتوویی و یەکڕیزی کورد بوو" (٥٩).

بەهەرحاڵ کاریگەری MED TV ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بوو، چونکە زێدەباری KTV، گروپە سەرەکییەکانی کوردی عێراق، واتا پارتی دیموکراتی کوردستان (PDK)لە ساڵی ١٩٩٩ KURDISTAN TV و یەکێتی نیشتمانی کوردستان (PUK) لە بەهاری ٢٠٠٠دا KURDSAT یان دامەزراند.

## تەکنۆلۆژی وەک هۆکارێکی بزوێنەر

میدیای نوێ بەشێوەیەکی دیکە دژایەتیکردن لەگەڵ دەوڵەتەکانی زەقتر کردووە: ئەو وێنانە کە لە تەلەفزیۆنەکاندا لە سەراسەری جیهاندا بڵاو دەبنەوە، لەگەڵ ئامرازەکانی پەیوەندییەکان تیکەڵ دەبێت و هەست و سۆزی گشتی خەڵک دەوروژێنێت و ئەم هەست و سۆزە خێرا بەرەو عاقاری شوناسسازی و کردەوەی بەهێز ئاڕاستە دەکرێت.

هەڕەشە لێکردن، سوکایەتیپێکردن یا شکستی سەمبولێکی گروپێک دەتوانێت کاریگەری زۆر لەسەر ئەندامەکانی ئەو گروپە دابنێت و هۆشیاری ئەتنیکی، بە سیاسیبوون و یەکگرتوویان زەقتر بکاتەوە (٦٠). بۆ نموونە کاتێک کە تورکیا ڕێبەری pkk ، عەبدوڵڵا ئۆجەلانی لە بەهاری ١٩٩٩ لە کینیا ڕفاند، کوردەکان خێرا کاردانەوەیان نیشاندا. کاتێک کە ئۆجەلان لە ئەفریقا گیرا، کاتژمێر ٢ی شەو لە نایرۆبی، پایتەختی کینیا خرایە ناو فڕۆکەیەکی تورکیا. پاش کەمتر لە دوو کاتژمێر ئەم ڕووداوە لە ئەورووپا بڵاو بووەوە و کاتژمێر ٥ ی سەرلەبەیانی ناڕەزایەتی کوردەکان دەستی پێکرد (٦١). بە یارمەتی کامێرای سەتەلایتەکان، تەلەفزیۆنەکان توانییان ڕووداوەکان بەو شێوەیە کە هەبوو بڵاو بکەنەوە و تەلەفۆن، فاکس و ئینتەرنێت توانییان زانیارییەکان بە خێرایی بگوازنەوە بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵگەی کورد لە سەراسەری جیهاندا (٦٢). کوردەکان بێ ئەوەی دەربازبوونی کات هەندێ ئارامیان بکاتەوە، هەستیان دەکرد کە سووکایەتییان پێکراوە و بوونە بە قوربانی، هەربۆیە توانییان لە

تەکنۆلۆژی پەیوەندییەکان کەڵک وەربگرن بۆ ئەوەی خۆپیشاندان لە کۆمەڵگەی نێونەتەوەییدا بەرێکخستن بکەن.

گەلێ لە بینەرانی خۆپیشاندانەکانی کوردەکان لە بەرامبەر کونسولگەرییەکان و باڵیۆزخانەکان لە سەراسەری وڵاتانی رۆژئاوا، لە خێرایی و سروشتیبوون و لەناکاوبوونی ئەم خۆپیشاندانانە ئەوەندە سەریان سوڕمابوو کە پێیانوابوو ئەم خۆپیشاندانانە لە پێشەوە بەرنامەی بۆ دارێژراوە. بەڵام شتێکی وا لە ئارادا نەبوو، هەر چەند کە ئەزموونی خۆپیشاندانەکانی پێشووتر (ئەو کاتە کە ئۆجەلان داوای مافی پەنابەری لە ئیتالیا و وڵاتانی دیکە کرد) بە واتای ئەوە بوو کە هێڵەکانی پەیوەندییە بەرێکخستنکراوەکان بۆ خۆپیشاندانگەلێکی وەها تازە لە کۆمەڵگەی کوردا گرنگی پێدراوە. لە ماوەی چەند کاتژمێردا بە فاکس، ئیمەیڵ و تەلەفۆن پەیام گەیشت بە دەستی زۆربەی کوردەکان کە تێیدا هاتبوو:"وەرن با لە بەرامبەر کونسولخانە و باڵیۆزخانەکاندا خۆپیشاندان بکەین": رۆژێک دوای گیرانی ئۆجەلان، ئەو رۆژنامە کوردییانە کە لە ئەوروپا بڵاو دەبوونەوە وەک OZGUR POLITIKA وتار و مانشێتیان بڵاو کردەوە و داوایان لە خوێنەرەکانیان کرد کە : "لە مافی خۆتان بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی کەڵک وەربگرن" (٦٣). تەنها دوو، سێ رۆژ پاش ئەوە کوردەکان لە شوێنە دوورەکان گەیشتن بە یەک بۆنەوەی لە گەلێ لە پایتەختەکانی سەراسەری جیهان رێپێوان بکەن (٦٤).

بەشداریکردن لە خۆپیشاندانەکان کە لە دەنگوباسی ئێواراندا لە تەلەفزیۆنەکاندا بڵاو دەبووە و خۆپیشاندانی کوردەکان سەراسەری جیهانی نیشاندەدا، رەوتی تەیاربوونی کوردەکانی بەهێزتر کرد. وێنەی

خۆپیشاندانەکان وەک کاریگەرترین ئامرازی پەیوەندییەکان لە تەلەفزیۆنەکاندا بڵاو بووە و توانی خێرا بگاتە لای خەڵک ـ تەنانەت خەڵکی نەخوێندەوار – و زیاتر لە میدیای چاپ و پەیوەندی زارەکی هەست و سۆزیان بورژێنێت (٦٥). پیاوێکی کورد کە لە خۆپیشاندانەکانی بەرامبەر باڵیۆزخانەی ئیسراییل لە شاری مونتراڵ لە کەنەدا، گیرا، دەیگوت: "کاتێک کە ئاپۆ (عەبدوڵلا ئۆجەلان) م لە تەلەفزیۆندا بینی کە لە لایەن تورکەکانەوە دەستگیر کراوە و دەست و چاوی بەستراوە، دڵم ئۆقرەی نەدەگرت، ئیللا دەبوایا کارێکم کردبایا . ئاپۆ زۆر خزمەتی کوردی کردووە، فیداکاری زۆری بۆ ئێمە کردووە". ئەم پیاوە هەروەها ئاماژەی بەوە کرد کە نەک تەنها کوردەکانی تورکیا یا ئەوانەی کە لایەنگری pkk-ن، بەڵکو کوردەکانی سەراسەری جیهان لەم خۆپیشاندانانەدا بەشدارییان کردووە (٦٦).

بۆ ناسیونالیستە کوردەکان کە بە دەستی نەبوونی یەگرتوویی کوردەکان لە مێژوودا دەناڵێنن، ئەوە گرنگە کە نەک تەنها کوردەکانی تورکیا، بەڵکو کوردەکانی عێراق، ئێران و سوریا و شوێنەکانی دیکە لەم خۆپیشاندانانەدا بەشدارییان کرد بۆ ئەوەی هاوسۆزی خۆیان لەگەڵ ئۆجەلان دەرببڕن. تەنانەت لە کوردستانی ئێران و عیراقیش خۆپیشاندانگەلی گەورە ئەنجامدرا. لە ئێران ئەم خۆپیشاندانە پاشان بە دژی ڕژێمی ئیسلامی ئێران هەڵگەڕایەوە (٦٧). گەلێ لەو کوردانەی کە لە شارەکانی ڕۆژئاوا خۆپیشاندانیان کرد خەڵکی پارچەکانی دیکەی کوردستان بوون. وێنەکانی ئۆجەلان بە دەستگیرکراوی کە لە

تەلەفزیۆنەکاندا بڵاو بووەوە، لەسەر زۆربەی کوردەکان، تەنانەت ئەوانە کە لایەنگری pkk نەبوون، کاریگەری دانا.

ئۆجەلان (بێ لە بەرچاوگرتنی ئیدوئولوژییەکەی) سیمبولی خەباتی کوردە و کوردەکانی سەراسەری جیهان دەستگیرکردنی ئەویان بە سوکایەتیپێکردنێکی دیکە و شکستێکی دیکە بۆ خۆیان دەزانی. کوردەکان واسەیری گەلێ لە زلهێزەکانی جیهان، لەوانە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسراییلیان دەکرد کە دەستیان لە دەستگیرکردنی ئۆجەلاندا هەبووە، ئەم ڕاستییەش هەست و سۆزی بەقوربانیبوونی کوردەکانی زیاتر وروژاند. ڕۆژنامەیNew York Times ، لەمبارەیە لە زمانی کوردێکەوە نووسی: "دایکی من قەد لایەنگری pkk و عەبدوڵڵا ئۆجەلان نەبووە، بەڵام کاتێک کە وێنەکانی ئەوی بە دەستبەستراوەیی بینی، گریا" (٦٨). کەوابوو MED TV و میدیاکانی دیکە کە ڕەوتی دەستگیرکردنی ئۆجەلانیان ڕاپۆرت دەدا، بە قازانجی ناسیونالیستە کوردەکان کاریان کرد و ئەم شکستەیان کرد بە دەرفەتێک و هاندەرێک بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵکی کورد سیاسیتر و تەیارتر بکەن.

ئەگەر تەکنۆلۆژی پەیوەندییە مۆدێرنەکان بە قازانجی بزوتنەوە ناسیونالیستییە نەتەوەییەکان کەڵکی لێ وەربگیردرێت، ئەو کاتە دەوڵەتگەلێک وەک تورکیا لە وەڵامدا هەوڵدەدەن کە نەهێڵن ئەم بزوتنەوانە دەستیان بگات بە میدیاکان. کەوابوو تورکیا، عێراق و سوریا و لە ڕادەیەکی کەمتردا ئێران[١٣٦] بە توندی میدیای چاپ و پەخشی کوردی

---

[136]- ئێستا ئێران لە هەمووی ئەم دەوڵەتانە زیاتر چاپ و پەخشی کوردی سانسۆر دەکات (وەرگێڕ).

سانسۆر دەکەن و یا بە تەواوی قەدەغەی دەکەن. بەڵام بەهەرحاڵ بەلەبەرچاوگرتنی بوونی کۆمەڵگە دیاسپۆراکان و دەستڕاگەیشتنی ئاسان بە تەکنۆلۆژی پەیوەندییەکان لە جیهانی گلوبالیزدا هەوڵگەلێکی سەرکوتکارانەی وەها لە لایەن دەوڵەتەکانەوە هیچ ئەنجامێکی نابێت.

تورکیا هەست بە هەڕەشەی MED TV دەکات چونکە تەنانەت بوونی ئەم ئێزگەیەش پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی دەوڵەتی تورکیا دەباتە ژێر پرسیار(٦٩). بەڵام ئەگەر تورکیا کە ئەندامێکی گرنگی پەیمانی ئاتلانتیکی باکوور (ناتۆ)یە و هیوادارە کە ببێت بە ئەندامی یەکێتی ئەورووپا، لە باتی سەرکوتکردنی کوردەکان زیاتر بەدیموکراسییەت هەڵسوکەوت بکات و ڕێز لە مافی مرۆڤ و سەروەری یاسا بگرێت و باش حکومەت بکات و یەکسانی کۆمەڵایەتی بچەسپێنێت، ئەو کاتە کەمینەی کوردی تورکیا هەست بەوە دەکات کە بەشێکە لە کۆماری تورکیا و هەوڵە جیاییخوازانە ناسیونالیستییە نەتەوەییەکانی کوردەکان نامێنێت. هەمان شت بۆ ئێران و عێراقیش وەڕاست دەگەڕێت. لە کۆمەڵگەیەکی دیموکراتدا کە مرۆڤ بتوانێت شوناسی خۆی بە ئازادی دەرببڕێت و لە مافە بنەڕەتییەکانی کەمینەکان واتا ئازادی سیاسی و کولتووری چێژ وەربگرێت، خەڵک وەدووی بەرنامە جیاییخوازەکان ناکەوێت.

بەهەرحاڵ لە کورتخایەندا، دەوڵەتگەلێک وەک تورکیا کە لەگەڵ کێشەی بزوتنەوە ناسیونالیستییە نەتەوەییەکان ڕووبەڕوون، دەبێ لە سووکایەتیکردن بە نەیارەکانیان خۆیان ببوێرن. بۆ دەوڵەتی تورکیا زیانەکانی بڵاوبوونەوەی وێنەکانی ئۆجەلانی دەستگیرکراو و دەستبەسراوکراو لەپاڵ ئاڵای تورکیا لە تەلەفزیۆنەکاندا، لە درێژخایەندا

له قازانجەکانی زۆرترە. شەش مانگ دوای گیرانی ئۆجەلان هەست و سۆزی کوردەکان دژی دەوڵەتی تورکیا بە بەراورد لەگەڵ ساڵی پێشووتر زیاتر بوو و زیاتر ئامادەبوون دژی دەوڵەت چەک هەڵبگرن (٧٠). شارەزایانی دیکەش ئەو دیاردەیە بەنیسبەت هەست و سۆزی ناسیونالیستی کوردەکان وەسف دەکەن و دەڵێن: "دەوڵەتی تورکیا دەڵێت ژمارەیەکی زۆر کەم لە کوردەکان پشتیوانی لە ناسیونالیزمی کورد دەکەن و زۆربەی هەرە زۆریان لەو ژیانە کە لە تورکیا هەیانە، ڕازین. بەڵام ئەگەر چوار ڕۆژ لە ناو پارێزگاکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بگەڕێیت، بۆت دەردەکەوێت کە ئەم شتە ڕاست نییە. ئێستا کوردەکان لە سەراسەری ئەم ناوچەیەدا زیاتر لە هەرکاتێکی دیکە بە نیسبەت شوناسی خۆیان هۆشیارن و زەحمەتە کەسێک هەبێت کە پشتیوانی لە ئامانجی ناسیونالیستی و تەنانەت خەباتی چەکداری pkk نەکات کە لە ساڵی ١٩٨٤وە دەستی پێکردووە (٧١).

## ئەنجام

دوو دیاردەی سەرەکی (پارچەپارچەبوونی کوردەکان لە ڕووی سیاسەت و خاکەوەو سەرکوتکردنیان لە لایەن دەوڵەتەکانەوە) ئەو پێویستی و پاڵپشتییە لە ناو کوردەکاندا دروست کردووە کە لەگەڵ تەکنۆلۆژی پەیوەندییە مۆدێرنەکان تیکەڵ بن. ئەم پێویستییە وای لە نوخبە ناسیونالیستە کوردەکان کرد کە بۆ یەکگرتوویی ئەتنیکی کورد هەوڵبدەن و پاوانی دەوڵەتەکان بەسەر تۆڕی زانیارییەکان و پەیوەندییەکان ببەنە ژێر پرسیار. مۆدێرنبوون و شارنشینبوونی کۆمەڵگەی کورد و هەروەها ئاڵوگۆڕەکانی نێو حەشیمەتی کوردەکان، بە تایبەت دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی دیاسپۆرای گەورە لە ئەورووپا، ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی خستە ناو بارودۆخێک کە بتوانن لە تەکنۆلۆژی پەیوەندییە نوێکان بە قازانجی خۆیان کەڵک وەربگرن. ئەمە دەرفەتی ئەوەی بە نەتەوەی دەنگ کپکراو و هەژاری کورد ڕەخساند، تا شوناسی نەتەوەیی کوردی خۆی پێبگەیەنێت و پڕوپاگەندەی بۆ بکات. کارگەلێکی زۆر گرنگ، لەوانە ستانداردکردنی زمانی کوردی ، پڕوپاگەندەکردنی ئەم زمانە، کۆکردنەوەی مێژوو و کولتووری کورد و بردنە ژێرپرسیاری ئاخێوی دەوڵەتەکان (کە حاشا لە شوناسی کورد دەکەن یا سەرکوتی دەکەن) ئێستا لە ڕێگای کەڵک وەرگرتن لە ئامرازە تەکنۆلۆژیکەکان وەک سەتەلایت، ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر بەڕێوە دەچێت .

لەم چوارچێوەیەدا و بەهۆی هەستکردن بە شوناسی کوردی کە تاڕادەیەک باش پێناسە کراوە، ئەو ڕووداوانە کە هەستی چەوساندنەوە و قوربانیبوونی کوردەکان بەرجەستە دەکات وەک بزوێنەر کار دەکات و هەستی ناسیونالیزمی

کوردی بەهێزتر دەکات. بە کورتی دەستگیربوونی ڕێبەری pkk عەبدوڵڵا ئۆجەلان، هۆشیاری نەتەوەیی کوردەکان، بەسیاسیبوونی کوردەکان و یەکگرتوویی کوردەکانی زیاتر کرد. خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە تەنها دەستگیربوونی ئۆجەلان نەبوو کە ئەم کاریگەرییەی لێکەوتەوە، بەڵکو بڵاوکردنەوەی ئەم ڕووداوە لە لایەن ڕاگەیاندنەکانەوە بووە هۆی ئەوەی کە کوردەکان لە سەراسەری گوندی جیهانیدا لەم ڕووداوە ئاگادار بن و پاشان کاردانەوە لە خۆیان نیشانبدەن.

بەهەرحاڵ ئەوە کە ئایا دیاردەیەکی وەها دەتوانێت دەورێکی هاوشێوە لەناو نەتەوە بێ دەوڵەتەکانی دیکەدا بگێڕێت، پرسیارێکە کە دەبێ وەڵام بدرێتەوە. نوخبە ناسیونالیستەکانی گروپە بێ دەوڵەتەکان کە لەگەڵ بارودۆخێکی هاوشێوەی بارودۆخی کوردەکان ڕووبەڕوون و ئارەزوو دەکەن کە لە بەرامبەر بندەستی گەلەکەیان ڕابوەستن، بەو ئەنجامە گەیشتوون کە مۆدێرنیتە و بوونی کۆمەڵگەیەکی گرنگی دیاسپۆرا لە ڕۆژئاوا، دوو فاکتۆری گرنگن کە توانایی ئەوان بۆ کەڵک وەرگرتن لە تەکنۆلۆژی پەیوەندییە مۆدێرنەکان و بەدەستخستنی قازانجەکانی یەکلایی دەکاتەوە. ئەو ڕاستییە کە گروپی باسک[137]، پەنجاب[138]، تامیل[139] و ئەرمەن[140] لە MED TV نزیک بوونەتەوە بۆ ئەوەی کەڵک لە ئەزموونی کوردەکان وەربگرن، نیشاندەدات کە تەکنۆلۆژی پەیوەندییە مۆدێرنەکان دزەی کردووەتە ناو گەلێ لە گروپە ناسیونالیستە نەتەوەییەکان.

مرۆڤ هەمیشە لە نموونەی کەسانی دیکە فێری شت دەبێت.

---

137- Basque

138- Punjabi

139- Tamil

140- Armenian

## پەراوێزەکان:


1- Donald Horowitz, Ethnic Groups in Conflict (Berkeley: University of California Press, 1985), 141-84.

2 -بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی پێکهاتنی شوناسی ئەتنیکی لە بەرامبەر هەڕەشەکاندا بنواڕن بۆ : David Brown, 'Ethnic Revival: Perspectives on State and Society, Third World Quarterly 11(1989) 8-11

پۆڵ برەس ئەوە زیاد دەکات کە: "هەموو بزوتنەوە ناسیونالیستییەکان لەسەر بنەمای سەرکوت لە لایەن گروپی ڕکابەرەوە، پاساو بۆ بوونی خۆیان دەهێننەوە". بنواڕن بۆ:

(Ethnicity and Nationalism [London: Sage, 1991] 43).

3-بۆ نموونە بڕوانن بۆ:

Benjamin R. Barber, Jihad Versus McWorld (New York: Times Books, 1995).

4- M. Hakan Yavuz, "A Preamble to the Kurdish Question: The Politics of Kurdish Identity, Journal of Muslim Minority Affairs 18 (1998), 13.

5-بۆ نموونە چەند ساڵ پێش لە شۆڕشی (ئیسلامی) ئێران شریتی لێدوانەکانی ئایەتوڵڵا خومەینی (کە نیشتەجێی پاریس بوو) دژی ڕژێمی شا بە قاچاغ دەچووە ناو ئێران و بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ناو شارەکانی ئێراندا بڵاو دەبووەوە. ئەم لێدوانانە ئۆپۆزیسیۆنی (موعارەزەی) دژی شا بەهێزتر کرد و بواری بۆ بەدەسەڵات گەیشتنی خومەینی خۆش کرد. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم دیاردەیە بنواڕن بۆ :

Mohammadi, Small Media, Big Revolution (Minneapolis: University of Minesota press,1994

6- John Hutchinson and Anthony D. Smith, eds., Ethnicity (Oxford: Oxford University Press, 1996), 6.

7- Mehrdad Izady, The Kurds: A Concise Handbook (Washington: 1992). Crane Russak,1992

8- Mordechai Nisan, Minorities in the Middle East (Jefferson, North Ca rolina: McFarland, 1991), 28
9- Sabri Cigerli, Le s Kurdes et Leur Histoire (Paris: LHarmattan, 1999), 20
بەهۆی هەستیاری سیاسی مەسەلەکە و نەبوونی ئامارێکی باوەڕپێکراو دیاریکردنی ژمارەی نفوسی کورد زەحمەتە. جگەرلی دەڵێت: "بە وتەی سەرۆک کۆماری تورکیا نفوسی کوردەکان لە تورکیا ١٢ ملیۆنە، بەڵام خودی کوردەکان دەڵێن ١٥ ملیۆن کەسن". ئەمیر حەسەنپوور لە وتارێکدا لەژێر ناوی"Med-TV"، بەریتانیاو دەوڵەتی تورکیا: هەوڵی نەتەوەیەکی بێ دەوڵەت بۆ یەکگرتن لە ئاسماندا" ئاماژە بە ئاماری ٧٠٠ هەزار کەسی کوردەکان لە ئەوروپا لە ساڵی ١٩٩٥دەکات. ئەم وتارە لە زانکۆی Freie Universitat Berlin, November 7, 1995. پێشکەش کراوە.

10 -هەمان سەرچاوە:٢٠-٢٢

11-ڕوانگەیەکی وەها بەهۆی سیاسیبوونی مەسەلەکە زۆر بەدی دەکرێت. ناسیونالیستەکانی تورکیا دان بە بوونی کوردەکاندا نانێن و ناسیونالیستەکانی ئێران، عێراق و سوریاش کوردەکان وەک گروپێک کە دەورێکی ئەوتۆیان لەم وڵاتانەدا نییە، پێناسە دەکەن.

12- Martin van Bruinessen, ‘‘Shifting National and Ethnic Identities, Journal of Muslim Minority Affairs 18 (1998), 40.

13-زمانی کوردی چەند زاراوەی هەیە. زاراوە سەرەکییەکان بریتین لە کرمانجی (کە لە سەرجەم ئەو وڵاتانەی کورد تێیاندا دەژی، قسەی پێدەکرێت) و سۆرانی کە (لە ئێران و عێراق قسەی پێدەکرێت).

Case of Kurdish, in EranFraenkel and Christina Kramer, eds., Language Conflict (New York: peter lang, 1993, 112
14- Amir Hassanpour, ‘‘The Pen and the Swor d: Literacy, Education and Revolution in Kurdistan, in Peter Freebody and Anthony R. Welch, eds., Knowledge, Culture and Power: International Perspectives on Literacy as Policy and Practice (London: Falmer Press, 1993), 42.
15- Hassanpour, ‘‘The Internationalization of Language Conflict, 133.

16-هەتا دەیەی ١٩٦٠ زۆربەی کوردەکان گوندنشین و نەخوێندەوار بوون، کەوابوو ناسیونالیزمی چاپ لە سەرەتا تووشی کۆمەڵێک گێرەوکێشە بوو. یەکەم ڕۆژنامەی کوردی بە ناوی "کوردستان" لە ساڵی ١٨٩٨ لە قاهیرە چاپ بوو. ئەم ڕۆژنامەیە

دەورێکی بەرچاوی لە بەهێزکردنی هۆشیاری نەتەوەیی لە نێوان کوردە خوێندەوارەکاندا گێڕا. "کوردستان" کاتێک باسی بارودۆخی زمانی کوردی دەکرد کە چاپەمەنی و ڕۆژنامەنووسی لە پاوانی زمانە زاڵەکاندا واتا تورکی، عەرەبی و فارسیدا بوو. بەهەرحاڵ ئەوکاتە تەنها گروپێکی بچووک خوێندەوار بوون و و گروپێکی خوێنەر (بەو شێوەیە کە لە کۆتایی سەدەی ۱۸ لە ئەوروپا سەریهەڵدا) لە ناو کورددا لە ئارادا نەبوو. بنواڕن بۆ:

**(Hassanpour, ''Med-TV, Britain, and the Turkish State, 5).**

**. 17- Benedict Anderson, Imagined Communities ( London: Verso, 1983)**

18- بۆ زانیاری زیاتر لەم پەیوەندییەدا بنواڕن بۆ:

**Philippe Boulanger, Le Destin Des Kurdes (Paris: L Harmattan, 1998:228-31, 1998) 228-31.**

**19- Nader Entessar, ''The Kurdish Mosaic of Discord, Third World Quarterly 11(1989) , 86.**

**20- A. Blaustein and G. Flanz, Constitutions of the Countries of the World: Turkey New York: Dobbs Ferry, 1994), 13**

**21- Selcan Hacaoglu, ''Turkey—Music of Rebellion, Associated Press, Fe bruary25, 1999; http://mnsi.net/-mergan95/25-2-99-AP-music-of-re bellion.html.**

**22- Abbas Vali, ''Where Kurdish Identity and Civil Society Clash, Warreport 47(1996) , 27**

PKK هەرچەند کە لە ناوەڕاستی دەیەی ۱۹۷۰ لە لایەن عەبدوڵا ئۆجەلانەوە لە ئانکارا دامەزرا بەڵام هەتا کاتی دەستپێکردنی خەباتی چەکداری لە ۱۹۸٤ زۆر ناسراو نەبوو.

23- بۆ زانیاری تەواوتر دەربارەی سەرکوتی کوردەکان بنواڕن بۆ:

**Warreport, Special Feature: The Crushing of Kurdish Civil Society 47 (1996); ''Democracy at Gun- point, The Economist: Turkey Survey (June 8-14, 1996); and David McDowell Modern History of the Kurds (London: I.B. Taurus, 1996),**

**(chaps 9, 19, 20 8, 14-18 (Iraq) and 10-13 (Iran**

**24- Amir Hassanpour, ''The Kurdish Experience, Middle East Report 189 (1994) , 4.**

25-هەمان سەرچاوە: ٤-٥

26-بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەوری مۆدێرنیزاسیۆن لە دروستبوونی چینێکی ڕۆشنبیری ناوین کە بزوتنەوەی ناسیونالیستی ڕێبەرایەتی دەکرد بنواڕن بۆ:

Crawford Young, The Politics of Cultural Pluralism (Madison: University of Wisconsin press.1976:26-38.45-47
27- McDowall, The Kurds, 418.

28-بۆ شیکردنەوەی میتۆدەکان و دەوری pkk لە بردنە ژێر پرسیاری ئاخێوی ڕەسمی حکومەتی تورکیا و بەهێزکردنی هۆشیاری ئەتنیکی کوردەکان بنواڕن بۆ:
Ismet Imset, The PKK (Ankara : Turkish Daily News Publications, 1992); and Ismail Besikci, Kurdistan and Turkish Colonialism ( London: Bla ckrose Press, 1991).
29-. Osten Wahlbeck, Kurdish Diasporas (New York: St. Martins Press, 1999), 61.

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی کۆچی کوردەکان بنواڕن بۆ :
Warreport, Special Question in an Environment of Insecurity: The Kurds in Turkey, Ethnic and Racial Studies 22 (Novembe r 1999), 991-1010; and Halkawt Hakim, ed., Les Kurdes par de là lexode ( Paris: LHar mattan, 1992).

کۆچ و دەرکردن لە ناوچە کوردنشینەکان بە تایبەت لە کاتی سەرکوتی دەوڵەت لە دەیەی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ و هەروەها پاش دەستپێکردنی خەباتی چەکداری pkk لە ١٩٨٤ زۆر زیاتر بوو.

30-ئەم ئازادیانە هەندێ جار بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەو کوردانە کە تواویانەتەوە و بوونە بە تورک لە ئەوروپا، دیسان شوناسی کوردی خۆیان بدۆزنەوە. بۆ زانیاری زیاتر لەم پەیوەندییەدا بنواڕن بۆ:
Claus Leggewie, "How Turks Becam e Kurds, not Germans, Dissent 43 summer,
31- Cigerli, Le s Kurde s, 20.
32- Wahlbeck, Kurdish Diasporas, 177.
33-Yavuz: A preamble to the Kurdish question:20
34- Aliza Marcus, "City in the War Zone, Middle East Report 189 (1994),
35- Michiel Leezenberg, "The Kurds and the City, Journal of Kurdish Studies 2(1997) , 62.

36-جگە لە ماڵپەڕە کوردییە کولتوورییەکان، حیزبە کوردەکان وەک KDPI PKK,PUK KDP,KOMALA هەموویان ماڵپەڕی خۆیان هەیە.

37-شەڕ و ناکۆکییەکان هەندێجار لە ئینتەرنێتدا زۆر پەرە دەسێنێت. دوابەدوای گیرانی ئۆجەلان، ماڵپەڕیTime Daily لە خوێنەرانی خۆی پرسیاری کردبوو کە ئایا نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێ پشتیوانی لە دامەزرانی دەوڵەتێکی کوردی بکات؟ هەندێ

له خوێنەرانی (تورک - وەرگێڕ) بێزاری خۆیان لەم پرسیارە دەربڕیبوو و هەندێکیان نووسیبوویان"من ئەم هەڵوێستەی ئێوە شەرمەزار دەکەم" و "ئێوە دەبێ داوای لێبوردن بکەن". بەهەرحاڵ زانکۆیەکی تورکیا و خوێندکارەکانی هێرشیان کردە سەر ماڵپەڕەکە. بنواڕن بۆ:

"When robots attack online polls: a report on ourselves, February 26, 1999; http://me mbers.xoom.com/

38-"Kurdish Liberation on the Internet, February 3, 1998 akin@kurdish.org,

39- Nick Ryan, "Television Nation, Wired Magazine, March 1997.

ئەمیر حەسەنپوور ئەوە زیاد دەکات کە : "دامەزراندنی سەتەلایتێکی ڕۆژانە واتا MED-TVلە لایەن کۆمەڵگەی کورد لە ئەورووپا، یەکەم نموونەی دەستڕاگەیشتنی نەتەوە و کەمینە بێ دەوڵەتەکان بە تەکنۆلۆژی پێشکەوتووتر لە تەلەزیزیون بوو. بنواڕن بۆ:

(Amir Hassanpour, "MED-TV, Britain, and the Turkish State, abstract).

-40هەمان سەرچاوە:٤٥

41- Amir Hassanpour, "Satellite Footprints as National Borders: MED- TV and the Extraterritoriality of State Sovereignty, Journal of Muslim Minority Affairs 18(1998) , 53.

42- ئەم بانگەشەیە ئەنجامی دیتنی خۆمە کە پاش چەند جار سەردانکردنی ناوچە لە هاوینی ١٩٩٤، ١٩٩٧-١٩٩٨ و هاوینی ١٩٩٩ بەم ئەنجامە گەیشتم.

43 -ساڵی ١٩٩٨ دەمتوانی بە زمانی تورکی لەگەڵ کوردەکان لە کوردستانی تورکیا قسە بکەم. لە کوردستانی ئێران، عێراق و سوریا بە زمانی ئینگلیزی، فەڕەنسی یا تورکی قسەم دەکرد یا قسەکانیان بەم زمانانە بۆم وەرگێڕان دەکرد. من لەگەڵ هەموو چین و توێژەکان، لەوانە منداڵ، دوکاندار، کرێکار، جوتیار، شوان، مامۆستا، خوێندکار و ئەندامان و کاربەدەستانی حزبە کوردەکان لە عێراق (زۆرتر یەکێتی و پارتی) قسەم کرد. من لە جولای ١٩٩٤ و سپتامبر-ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠ سەردانی کوردستانی عێراقم کرد. لە جولای ١٩٩٩ و سپتامبر - ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠ سەردانی کوردستانی ئێران و لە ژوەن -جولای ١٩٩٨ سەردانی کوردستانی سوریام

کرد. هەموو ئەو کوردانە کە من قسەم لەگەڵ کردن دەیانگوت کە MED-TV تەلەفزیۆنی خۆشەویستی کوردەکانە. کاربەدەستێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە تورکیاش دەیگوت کە بۆ کوردەکانی ئێران، عێراق و سوریا ئەم تەلەفزیۆنە خۆشەویستە. سەرەڕای ئەو ڕاستییە کە MED-TV بە گشتی وەک تەلەفزیۆنی PKK سەیر دەکرێت، ئەم کاربەدەستەی یەکێتی دەیگوت کە MED-TV تەلەفزیۆنی خۆشەویستی ئەویشە (گفتوگۆ لەگەڵ نووسەر، ٥ی ئاداری ١٩٩٩).

44- Ryan, "Television Nation, 46.

ئەمیر حەسەنپوور وردەکارییەکانی ئەو مەترسییانە دەخاتەڕوو کە بینەرانی ئەم تەلەفزیۆنە لەگەڵیدا ڕووبەڕوو دەبوون و دەڵێت: "لە سەراسەری ناوچەی کوردنشین، هێزەکانی پۆلیس و ژاندارمری دەزگاکانی ئەم سەتەلایتەیان دەشکاند، بۆ نموونە لە ناوچەی ئەروح (باتمان) سوپای تورکیا فرۆشتنی ساجی سەتەلایتی قەدەغە کرد و هۆشداری بە خەڵک دا کە نەیکڕن. کاتێک کە MED-TV ڕایگەیاند کە پەرلەمانی کورد لە دەرەوەی وڵات دادەمەزرێت (١٢ی ئاوریلی ١٩٩٥) پۆلیس هێرشی کردە سەر ئەو قاوەخانانەی کە سەتەلایتیان هەبوو و بینەرانی ئەم تەلەفزیۆنەی دەستگیر دەکرد و سەتەلایتەکانی دەشکاند. ڕۆژنامەی کوردی "YENI POLOTIKA" کە ئێستا لە تورکیا داخراوە) هەندێک ڕاپۆرتی دەربارەی گرتن و ئەشکەنجە کردنی بینەرانی ئەم تەلەفزیۆنە بڵاو کردەوە (بۆ نموونە بنواڕن بۆ ڕاپۆرتەکانی ئەم ڕۆژنامەیە لە بەرواری مای ١٩٩٥، بە تایبەت ١١ مای ١٩٩٥). بەهەرحاڵ سەرەڕای ئەم سەرکوتە، هەر دوکانێک هەفتەیەک ١٥٠ دانە سەتەلایتی دەفرۆشت. تەکنیککارێکی کورد کە دوکانەکەی کەوتبووە بەر هێرشی پۆلیس دەیگوت کە ئەو کەسانەی کە کاریان دامەزراندنی ساجی سەتەلایتە لە ناوچە کوردنشینەکان سەرکوت دەکرێن. ئەم پیاوە کە دەترسا لەبەرامبەر کامێرادا قسە بکات دەیگوت کە هەموو شەوێک ١٥دانە سەتەلایت دادەمەزرێنێت. بنواڕن بۆ:

("Satellite Footprints, 70; Hassanpour takes this last quotation from Beating the Censor, A Frontline News report produced by Tony Smith and Tim Exton aired on Swedens Channel 1, 25 September, 1995).

خودی ئێزگەی MED-TV لە بەلژیکا، بەریتانیا و ئەڵمانیاش کەوتە بەر هێرشی پۆلیس (بەڵام پۆلیس نەیتوانی هیچ بەڵگەیەکی تاوان لەم ئێزگەیەدا بدۆزێتەوە) و هەندێ کەسی نەناسراو هێرشیان کردە سەر کارمەندانی ئەم تەلەفزیۆنە. بنواڕن بۆ:
(Ryan, ''Television Nation, 92).

45- Hassanpour, ''Satellite Footprints, 70; quote s from '' Turkey Said to be Considering Allowing Kurdish Broadcasts, Turkish Daily News (Ankar a) -June1996

46-هەمان سەرچاوە:٤٦

47-بەهەرحاڵ لە ١٩٩٢ بیرۆکەی بڵاوکردنەوەی بەرنامە بە زمانی کوردی بەهۆی ئەوەی کە دژی یاسای بنەڕەتی تورکیابوو، لە لایەن دمیرل، سەرۆک وەزیرانی تورکیا ڕەت کرایەوە. بنواڕن بۆ:
(Amir Hassanpour,''Language Rights in the Emerging World Linguistic Order : The State , the Marke t and Communication Technologies, in Miklos Kontra, ed., Language: ARight and a Resource [Budapest: CEU Press, 1998], 228).

48-ئەمیر حەسەنپوور دەڵێت: "ڕوونە کە هەر چرکەیەک لە بەرنامەکانی-MED TVدەسەڵاتی تورکیا بە توندی دەباتە ژێر پرسیارەوە. لۆگۆی MED-TV کە لە سوچی چەپی شاشەی ئەم تەلەفزیۆنەدا نووسراوە، جەختکردنەوەیە لەسەر باوباپیرانی کوردەکان (واتا کورد لە نەوەی مادن و تورک نین). هەروەها بە واتای جەختکردنەوە لەسەر مافی بەدەوڵەتبوونی کوردە. ئەم لۆگۆیە لە سێ ڕەنگی سوور، زەرد و سەوز پێکهاتووە کە ڕەنگی ئاڵای کوردیشە. لەمە زیاتر خودی ئاڵای کوردیش لە بەرنامەکانی ئەم تەلەفزیۆنەدا دەردەکەوێت (لە دەنگوباس و زانیارییەوە بگرە تا بەرنامەی سەرگەرمی و کولتووری)و بەرنامەکانی ڕۆژانەی بە سرودی نەتەوەیی "ئەی ڕەقیب "دەست پێدەکات. بوونی ئاڵای نەتەوەیی کورد و سرودی نەتەوەیی بە واتای ئەوەیە کە MED-TV ئەوەندە هێزی هەیە کە نەک وەک بیسەر و بینەر، بەڵکو وەک هاووڵاتیانی حکومەتی کوردستان لەگەڵ کوردەکاندا مامەڵە بکات.

49-هەمان سەرچاوە

50- Language Rights:233 :" Hassanpour

51-گفتوگۆی نووسەر لەگەڵ حیکمەت تەبەق، لە دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی MED-TV، 2ی ئۆگوستی ١٩٩٩. بە لەبەرچاوگرتنی ڕکابەرییە مێژووییەکانی ناسیونالیستە کورد و ئەرمەنییەکان لەسەر هەندێ لە ناوچەکان و هەروەها بوونی دەستی هەندێ لە کوردەکان لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکاندا ، تا ڕادەیەک ئەوە سەرنجڕاکێشە کە نوێنەرانی ئەرمەنی لە MED-TV نزیک بوونەتەوە.

52-“Britain Shuts down Kurd TV Channel, Reuters, April 23, 1999; http://www.mnsi.net/-mergan95/23-4-99- Reu-med-tv-closed.html; this URL no longer functions.

53-“KDP Launches Anti-PKK TV Station, Arm the Spirit, February 22 1999;

54-کاربەدەستانیPDK (پارتی دیموکراتی کوردستان) ئەوەیان ڕەت دەکردەوە کە KURDISTAN TV وەک ئێزگەیەک دژ بە PKK دامەزرابێت و دەیانگوت کە ئامانجی ئەم تەلەفزیۆنە ئەوەیە کە دەنگی کوردستانی عێراق، خەڵکەکەی، ڕاستییەکانی و کولتوورەکەی بگوازێتەوە (گفتوگۆی نووسەر لەگەڵ سەفین دزەیی، نوێنەری پارتی لە ئانکارا، ١١ی ژوەنی ١٩٩٩)

55-وادیارە دەوڵەتی تورکیا زۆر ئاگاداری گرنگی و دەوری ئەم تەلەفزیۆنە بوو، بۆ نموونە هەرچەند کە فیلمی شێردڵ (BRAVE HEART) لە سەراسەری ڕۆژئاوای تورکیا نمایش کرا، بەڵام دەوڵەت نەیهێشت ئەم فیلمە لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا (کە کوردنشینە) نمایش بکرێت چونکە لەوە دەترسا کە کوردەکان بارودۆخی خۆیان لە ناو ئەم فیلمەدا ببیننەوە، چونکە بارودۆخی کوردەکان و سەرکوتی خەڵکی سکاتلەند بە دەستی دەوڵەتی بەریتانیا (کە لەم فیلمەدا خرابووە ڕوو)، زۆر لە یەک دەچوو.

56-گفتوگۆی نووسەر لەگەڵ حیکمەت تەبەق، ٢٧ی ئۆگوستی ١٩٩٩.

57-هۆشیاری ئەتنیکی دەکرێت وەک ئەو ڕێژەیە پێناسە بکرێت کە خەڵک خۆیان وەک ئەندامی گروپێکی ئەتنیکی دەناسێنن و ئەو بایەخە کە بۆ ئەم شوناسە دایدەنێن. لەم ڕووەوە ئەم دەستەواژەیە لە پێناسەکەی براس (BRASS) دەچێت کە دەڵێت: "مەبەست لە ئەتنیکی سیاسی ئەو ڕێژەیەیە کە خەڵک وەک نەتەوە سەیری

گروپی ئەتنیکی خۆیان دەکەن و ئەمەش  لە بانگەشەکانی ئەوان لەسەر مافی نەتەوەیی بەدەوڵەتبوون، ئۆتۆنۆمی و یان لانیکەم هەندێ مافی تایبەتی کولتووری و سیاسی (لەسەر بنەمای جیاوازبوونی نەتەوەکەیان لە کەسانی دیکەی ئەو وڵاتە)دا دیار دەبێت.

بنواڕن بۆ :

David Brown ‘‘Ethnic revival: perspectives on state and society and Nader Entessar, ‘‘The Kurdish mosaic of discord, both in Third World Quarterly 11 (1989), 1-17 and 83-98,

یەکێتی ئەتنیکی  لە باتی ئەوەی خوازیاری هاوئاهەنگی تەواو (بەڵام ناواقعبینانەی ئەو گروپە ئەتنیکییە) بێت، ئاماژەیە بەو ڕێژەیە کە ئەندامانی گروپ خۆیان لە بەرامبەر کەسانی دیکەدا یەکگرتوو نیشاندەدەن و یارمەتی گروپەکانی دیکە نادەن و زەرەر لە ئەندامانی گروپەکانی دیکە دەدەن.

58- MED-TV, ‘‘Kurdish Satellite Television, brochure published in London, Fall 1995 (quoted in Hassanpour, ‘‘Satellite Footprints, 55).

59- گفتوگۆی نووسەر لەگەڵ حیکمەت تەبەق، ٢٧ی ئۆگوستی ١٩٩٩. بۆ بیروبۆچوونی دیکە سەبارەت بە دەوری MED-TV لە یەکگرتنی کوردەکاندا بنواڕن بۆ:

-Philippe Boulange r, Le Destin Des Kurds (Paris: LHarmattan, 1998) 228

60-هەندێ لەو لێکۆڵینەوە دەروونناسییانە کە باسی ئەم مەسەلەیە و بابەتە پەیوەندیدارەکانی دیکەیان کردووە بریتین لە :

J. Martin and A. Murray, ‘‘ Catalysts for collective violence, in R. Folger, ed., The Sense of Injustice: Social Psychological Perspective s ( New York: Plenum, 1984) 95-139; Crawford Young, ‘‘Patterns of Social Con ict: State, Class and Ethnicity, Daedalus 111 (1982), 91-110; and Abbas Valy, ‘‘The Kurds and Their ‘Others: Fragmented Identity and Fragmented Politics, Comparative Studies of South Asia, Africa and the Middle East 18 (1998), 82-95.

61- RFE/RLIraq Report, 23 April 1999; http://www.mnsi.net/-merga n95/23-4-99-Ir q- Report.html.

62-ئەم زانیاریانە لە ئەنجامی گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێوەبەرانی "ناوەندی کۆمەڵگەی کورد لە تورنتۆ " و خۆپیشاندەرانی کورد لە تورنتۆ و مونتراڵ بەدەستهاتووە. ئەو خۆپیشاندەرانە کە من قسەم لەگەڵ کردن هەواڵی گیرانی "ئۆجەلان" یان یا ڕاستەوخۆ لە MED-TV بیستبوو یا لە لایەن کەسانی دیکەوە تەلەفونیان بۆ کرابوو یا ئیمەیلیان بۆ نێردرابوو. ئەمانە پاشان داوایان لە بنەماڵە و دۆستەکانی ناو کۆمەڵە کردبوو کە زوو لە بەرامبەر کونسوڵگەری ئیسرائیل و یۆنان لە تورنتۆ و مونتراڵ خۆپێشاندان بکەن. لە ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بۆ هەندێ لە خۆپیشاندەران تەلەفون کرابوو یان ئیمەیلیان بۆ نێردرابوو و پێیانوتبوون ئەوانیش لە شوێنی خۆیان خۆپیشاندان دەکەن.

**63- Andrew Buncombe, "Diaspora hear the word on Kurd TV, The Independent(London) February 19, 1999**

لەم وتارەدا هەروەها نووسرابوو کە: "لە گوندییە هەژارەکانی ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا بگرە تا کۆچبەرانی بازرگانی تا ڕادەیەک خۆشبژێوی باکووری لەندەن، کوردەکانی سەراسەری جیهان تۆڕێکی کاریگەری زانیاری و هەواڵیان دروستکردووە.

64-یەکێ لە بەڕێوەبەرانی "ناوەندی کۆمەڵەی کورد لە تورنتۆ" بە نووسەری گوت کە سێ ڕۆژی خایاندووە تا توانیویانە پاس کرێ بکەن و خەڵک بنێرن بۆ ئوتاوا بۆ ئەوەی لە بەرامبەر باڵیۆزخانەی تورکیا خۆپیشاندان بکەن.

65-حیکمەت تەبەق جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە تەنها MED-TV نەبووە کە خەڵکی خستووەتە ناو جموجۆڵ، بەڵکو ئەو وێنە سوکایەتی پێکراوانەی ئۆجەلان (بە چاوبەستراوەیی) کە تورکیا بڵاوی کردووەتەوە، خەڵکی خستووەتە ناو جموجۆڵ و هەست و سۆزی خەڵکی وروژاندووە. ئەم وێنانە لە لایەن تەلەفزیۆنەکانی سەراسەری جیهانەوە بڵاو کرایەوە (گفتوگۆی نووسەر لە گەڵ حیکمەت تەبەق، ۲۸ی ئوگوستی ۱۹۹۹)

66-گفتوگۆ لەگەڵ کوردێکی کوردستانی تورکیا (١٦ی نوامبری ٢٠٠٠) کە لە ساڵی ١٩٩٧ەوە مافی پەنابەری لە کەنەدا وەرگرتبوو .

67-لە کاتێکدا کە ئەوە بۆ ڕۆژنامە سەریەخۆکان دەست نادات کە ڕاستییەکانی ئەم ڕووداوە بزانن، بەڵام ڕوونە کە کۆمەڵێک ناڕەزایەتی گرنگ دژ بە کۆماری ئیسلامی ئێران ڕوویداوە. ئەو خۆپیشاندانانە کە بۆ لایەنگری لە ئۆجەلان و دژ بە ڕژێمی ئیسلامی ئێران ڕوویدا، نیشانەی گرنگی مەسەلەی کورد و ناڕازیبوونی کوردەکانی ئێران لە ڕژێمی ئێران بوو. بنواڕن بۆ
(WKI Press Release, March 3, 1999, www.clark.ne t/kurd/prIranViolence.html).

68- Stephen Kinzer, "Nationalism is Mood in Turkeys Kurdish Enclaves, The New York Times, May 16, 1999.

69-هۆکاری ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە زمانی تورکی تەنها زمانێکە کە لە تورکیا ڕێپێدراوە لە شوێنە گشتییەکاند قسەی پێبکرێت. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی کۆماری تورکیا، کۆماری ئیسلامی ئێران و دەوڵەتی عێراق بە نیسبەت مافەکانی کوردەکان بنواڕن بۆ کتێبەکەی دەیڤید مەکداوڵ بە ناوی "مێژووی هاوچەرخی کورد."

70-لە ئەنجامی گفتوگۆ لەگەڵ جوتیاران، بازرگانەکان و خوێندکارانی کورد، بە تایبەت لە دیاربەکر، وان و حەکاری بۆم دەرکەوت کە ڕێژەی دژایەتی کوردەکان لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا لە هاوینی ١٩٩٩ لە ١٩٩٨ زیاتر بووە. ئەڵبەتە ئەمە ئەنجامی تێگەیشتنی خۆم بوو، چونکە بەهۆی بارودۆخی تورکیا، مرۆڤ ناتوانێت هیچ هەڵسەنگاندنێکی بیروڕای گشتی یا لێکۆڵینەوەیەک لە نێو کوردەکاندا بکات.
71- Kinzer, "Nationalism is Mood in Turkeys Kurdish Enclaves.

## کتێبەکانی دیکەی وەرگێڕ:

١- مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا ، ٧٢٠ لاپەڕە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١

٢- سیاسەتی ئەمریکا لە کوردستان لە ڕوانگەی پسپۆڕانی ڕۆژئاواییی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١١

٣- کوردستان و کورد لە ڕوانگەی نەخشەوانییەوە (١٢٠ نەخشەی مێژوویی کوردستان لەگەڵ ٥٢٠ لاپەڕە لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩

٤- کوردستانی عێراق لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا،٨٥٠ لاپەڕە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩

٥- کوردستانی ئێران و تورکیا لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا،٧٥٠ لاپەڕە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر،٢٠٠٩

٦- تراژیدیای کورد، ژێرار شاڵیان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی سۆرانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠١٠

٧- کولتوور و ناسنامەی کورد، فیلیپ کرینبروک- کریستییەن ئالیسۆن، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨

٨- تراژیدیا کوردان (ڕاپۆرتەک ژبۆ نەتەوەیێن یەکبوویی)، ڤەرگەرا ژ ئینگلیزی بۆ کوردیا کورمانجی، چاپخانەیا وەزارەتا ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٨

٩- بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی تورکیا ( پاوڵ وایت)، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.

١٠- شۆڕشی مەزنی ئەیلوول لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا، کۆکردنەوە و وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە.

